بسم الله الرحمن الرحيم

# گەورەیی زانستی شەرعی

# و بەڕێزی خوێندکارانی

# گەورەیی زانستی شەرعی

## و بەڕێزی خوێندکارانی

بۆ پۆلی:

یەکەمی ئامادەیی ئامەد


نوسینی

عبدالقادر عبدالعزیز

وەرگێرانی

مامۆستا کرێکار

# گەورەیی زانستی شەرعی

نوسینـــــــــی: عبدالقادر عبدالعزیز
وەرگێرانـــــــی: مامۆستا کرێکار
بـــۆ پـــۆلی: یەکەمی ئامەد
نەخشەســـــازی: ئیـسـلامڕەو
ساڵـــــــــــی: ١٤٣٧ك-٢٠١٦ز

لە بڵاوکراوەکانی
زانکۆی ئازاي دیراساتی ئیسلامی(زادی)

شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ

وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً

بِالْقِسْطِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ

...........ال عمران ١٨ .....................

بسم الله الرحمن الرحيم

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا اله إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ.

يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيرَاً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيبَاً

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديدَاً، يُصْلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزَاً عَظيماً

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وكُلَّ ضَلالَةٍ في النَّارِ.

## پێشەکی وەرگێڕ

دکتۆر عەبدولقادر عەبدولعەزیز کە ناوی ئەسڵی خۆی سەیید شەریف سەیید ئیمامەو پسپۆڕی بواری پزیشکییە، دوای نووسینی کتێبی (العمدة في اعداد العدة) ناسرا.. زانایەکی شەرعناس و داعییەکی ئیسلامی و کەسایەتییەکی جیهادیی بوو. لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابوردوودا لە لایەنی ئاڕاستەی شەرعییەوە سەرپەرشتی زۆر لە سەربازگەکانی موجاهیدە عەرەبەکانی ئەفغانستانی دەکرد.. جارێکیان کابرایەکی خاوەن پرۆژەی خوێندن لە ئەفغانستان، کە پرۆژەکەی شکستی هێنا دکتۆر عبداللە عەززامی رحمه الله تێدا تۆمەتبار کرد، کە گوایە ئەو هۆکاری سەرنەکەوتنی پرۆژەکەیەتی.. لە (ئەنجومەنی عەرەب)ەکان سکاڵای لەسەر دکتۆری رەحمەتی تۆمار کرد. دادگایان بۆ رێك خرا، قازییەکە ئەم دکتۆر عەبدولقادر بن عەبدولعەزیزە بوو کە ئەو کاتە بە (دکتۆر فەزڵ) دەناسرا.. مەبەستم لەمە ناساندنی مەنزیلەی بەرزی زانایەتی ئەم نوسەرە گەورەیەیە کە هێشتا زیندووە. خوا بیپارێزێت. منیش الحمدللە ئەو کاتە لەوێ بووم و لەو نزیك بووم.

نوسەری بەڕێز دواتر کتێبی (الجامع)ی نووسی - هەردوو کتێبەکەی بوونە سەرچاوەیەکی ئاڕستەوانی گەنجانی موسوڵمان لە هەموو شوێنێك- منیش هەردوو کتێبەکەم دەمێك بوو هەبوو، پێم چاك بوو، بابەتیان لێ بکەمە کوردیی. ئەمەی بەردەست بە کوردیی کراوی بەشێکە لە بابی دووەمی کتێبی الجامعەکە، کە دەربارەی زانستی شەرعەو کردوومانە بە بەرنامەی خوێندن لە ئامادەیی

ئامەدی ئیسلامی سەر بە زانکۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی لەسەر ئینتەرنێت.
بەشەکانی تری بابەتەکە هەر لەسەر زانستی شەرعیین و کراون بە کوردیی، کە بە ئومێدین ان شاء الله لە پۆلەکانی تری ئامادەییەکەماندا بخوێندرێن .

خوای گەورە خوێندکارە عەزیزەکانمان لە خوێندن و تێگەیشتنی باسەکانییدا سەرکەوتوو بکات..

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما

کرێکار

# پێشەکیەك

## (مەبەست لەو زانستییەی کە خوێندکارەکانی مەتح کراون)

١- **مەبەست لە زانستی شەرعی:** ئەو زانستیەیە کە خوای پەروەردگار لە ئاسمانەوە بە وەحی بۆ پێغەمبەری مەزن محمدی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناردۆتە خوارەوە، ئەمیش لە قورئان و فەرموودەدا روون کراوەتەوە، ئینجا لەم دوو سەرچاوەیەوە لقە زانستی تری شەرعی جوێ بۆتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: (وَأَنزَلَ اللّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا) النساء/١١٣ واتە: خوای گەورە قورئان و حیکمەتی بۆ ناردوویتە خوارەوە، ئەوەی نەشتدەزانی ئەو فێری کردیت، بەراستی فەزڵی خوا گەورەیە لەسەرت. هەروەها دەفەرموێ: (وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) الشورى/٥٢ واتە: ئێمە هەر ئاوا رۆحێکمان (قورئانێکمان) لە لایەن خۆمانەوە بۆ تۆ نارد، ئەو زەمانە نەدەتزانی قورئان چییەو نەدەتزانی باوەڕ چییە؟ بەڵام ئێمە کردمانە تیشکی روناکیەك کە هەر کەسێکمان وویست لە بەندەکانی خۆمان ڕێنمایی پێبکەین. تۆش بە راستی ڕێنمایی خەڵکی بەرەو ڕێبازێکی راست دەکەیت.. هەروەها: (فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ) آل عمران/٦١ واتە: جا هەر کەس دوای ئەوەی زانستیەکەت بۆ هات، موناقەشەت بکات ..

خوای پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کە لە ڕێگای وەحیەوە زانستی بۆ پێغەمبەری نازدار صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناردووە، زانستیەکەشی بەوە وەسف کردووە کە نوورە، تیشکی روناکییە، چونکە دڵە مردووەکانی پێ زیندوو دەکاتەوەو

خەڵکی لە تاریکییەوە بەرەو روناکی دەردەهێنێت پێی، وەکو دەفەرموێ: (أَوَ مَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)الانعام/١٢٢ واتە: ئایا ئەو کەسەی کە مردوو بووەو ئێمە زیندوومان کردۆتەوەو نوورمان پێ بەخشیوە تا (بە شارەزایی و دید روونیەوە) بە نێو خەڵکیدا بڕوات، ئەمە وەکو ئەو کەسە وایە کە لە تاریکستانیدایەو ناتوانێت خۆی لێ قوتار کات؟! ئاخر ئە ئاوا ئەو کارو کردەوانەی کافران دەیان کەن، لەبەر چاوی خۆیان جوان کراوە ..

ئیبنو حەجەر -رحمە اللە- دەفەرموێ: (مەبەست لە زانستی: ئەو زانستیە شەرعیەیە کە فەرمانی دینەکە روون دەکاتەوە، لە خواپەرستی و مامەڵەو رەفتاردا، لە ناسینی خواو زانینی سیفات و ئەو ئەرکانەی لەسەر مرۆڤ بەرامبەر خوای گەورە دیاری کراون لە بە دوور راگرتنی لە کەم و کورتی.. ئەوی ئەمانەش لە خۆ دەگرێت تەفسیری قورئان و فەرموودە و شەرع (فِقە)ە..[١]

ئەمە ئەو زانستییەیە کە مەتح کراوە، ئەوی بەڵگەکان باسی پیرۆزی و گرنگی خۆی و مەزنی و بەڕێزی خوێندکارانی دەکەن. ئەمەشە کە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە، ئەگینا خۆ زانستی تر زۆرن. زانستی وا هەیە هەر بە خراپ ناوزەد کراوەو هەشە بە چاك باس کراوە.. لەوەی کە بە خراپ ناوزەد کراوە، ئەوەیە کە

---

١ فتح الباری /١/١٤١

خوای گەورە دەرهەقی فەرموویەتی: (وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ) البقرة/١٠٢ واتە: ئەوە فێر دەبن کە زیانیان پێ دەگەیێنێت نەك سوود (لێرەدا مەبەست لە سیحر زانینە)، بۆ خۆشیان ئەوە دەزانن کە ئەوان مامەڵەی پێوە دەکەن هیچ پشکێکی قیامەتیان بۆ مسۆگەر ناکات.. کەوا بوو . وەکو خوای پەروەردگار بەیانی دەکات . زانستی وا هەیە زیانبەخشەو هیچ سوودێکی نییە، وەکو ئەو زانستییەی کە کافرە بێدینەکان لە بەرهەڵستیکردنی پەیام و بانگەوازی پێغەمبەرانی خوادا سەلامیان لێ بێت بەکاریان دەهێنا.. کە خوای گەورە دەرهەقیان فەرموویەتی: (فَلَمَّا جَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُون) غافر/٨٣ واتە: کاتێك کە پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگەو نیشانەی روونەوە لێیان دەهاتنە پێش، ئەوان (کافرەکان) بە زانستیەکانی خۆیان خۆشحاڵ دەبوون! بەڵام خوای گەورە دوایی خۆیان و رەفتاریانی مەفح کردەوە ..

زانستی جۆری وای هەیە لە هەندێك حاڵەتدا مەتحکراوە، وەکو ئەو زانستیانەی لە دنیادا بەسوودن، کە لە ئیسلامدا فەرزی کیفایەن، وەکو زانستیەکانی پزیشکی و چاندن و پیشەسازی و..هتد. ئەوانەی کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەرهەقیان فەرمووی: (أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ)[١] واتە: ئێوە خۆتان لە کاروباری دنیایی خۆتاندا شارەزاترن .

---

[١] رواه مسلم.

**٢- خوێندكارانی زانستی شەرعی:** ئەمما ئەو كەسانەی كە بەڵگەكان لەسەر گەورەیی خۆیان و ڕێزی پلەو پایەیان و قەدری بوونیان و زۆری پاداشتیان هاتووە، ئەوە ئەو كەسانەن كە ئەهلی ئەم زانستییەن، ئەوانەن كە هەرچی وەریان گرتووەو فێری بوون یەكسەر لە خۆیاندا جێبەجێیان كردووە، ئینجا گەیاندوویانەتەوە بە خەڵكی، بە فێركردنەوەو ڕوونكردنەوەی.. خۆ بەڵگەی سەرزەنشتی لەسەر ئەو كەسانە زۆر هاتووە كە زانستیەكە فێربوون و كاریان پێنەكردووە، وەكو كە خوای گەورە دەربارەی ئەوانە فەرموویەتی: (كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ) الصَّفّ/٣ واتە: گەورەترین شتێك كە ڕقی خوا هەستێنێت ئەوەیە: ئەوی دەیڵێن خۆتان كاری پێنەكەن.. لەمەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە كە ئەو كەسانەی مەتح دەكرێن ئەو زانایانەن كە كار بە زانستیەكەی خۆیان دەكەن، ئەوی زەمیش دەكرێت ئەو زانایانەن كە كار بە زانستیەكەی خۆیان ناكەن. بگرە خوای گەورە ئەو زانایانەی كار بە زانستیەكەی خۆیان ناكەن لە ڕیزی نەزانان حسێبی كردوون! ئەوەتا دەفەرموێ: (وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ) البقرة/١٠٢ واتە: ئەوە فێر دەبن كە زیانیان پێ دەگەیێنێت نەك سوود (لێرەدا مەبەست لە سیحر زانینە)، بۆ خۆشیان ئەوە دەزانن كە ئەوان مامەڵەی پێوە دەكەن هیچ پشكێكی قیامەتیان بۆ مسۆگەر ناكات، بەڕاستی - گەر بیانزانیایە- پەییان بەوە دەبرد كە خۆیان بە نرخێكی كەم و گەن فرۆشتووە.. سەیری سەرەتای ئایەتەكە بكە كە ئەهلی كیتاب (خاوەن پەیامە

ئاسمانیەکان)ی بە خاوەن زانست ناساند، بە پیتی (وَلَقَدْ) یش جەختی زیاتری لەسەر شارەزاییان کردۆتەوە، کەچی لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: (لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ) گەر بیانزانیایە!! کەوابوو زانا بوون، بەڵام کاریان بە زانستیەکەی خۆیان نەکرد، بەمەش چوونەوە ریزی ئەو کەسانەی هیچ نازانن !!

شەیخولئیسلام ئیبنوتەیمییە دەفەرموێ: (ئەوەی موسوڵمانان دەیزانن و لە بیرو ژیرییاندا جێی خۆی گرتووە، ئەوەیە کە ئەو کەسانە میراتگری نێرراوانی خواو جێنشینی پێغەمبەرانن کە دینەکەیان بە شارەزایی وەرگرتووەو بە کردەوە پیادەیان کردووەو بانگەوازەکەی خواو پێغەمبەریان هەڵگرتووە، لە راستیدا ئا ئەوانە شوێن کەوتووی سەرڕاستی پێغەمبەرانن، ئەوانەشن کە لە پلەو پایەی ئەو دەستەیەدان کە پاڵفتەکراون و بوونەتە ئەو خاکە بە پیتەی ئاوی بارانەکەی لە خۆ گرتووەو پاوەن و سەوزاییەکی زۆریشی پێ رواندووە. گەشەو نەشونمای بە خۆی پێکردووەو گەشەو نەشونمای بە خەڵکانی تریش کردووە. ئەوانە هەر ئەو کەسانەن کە دیدی بەرفراوانی دینیی و ئیرادەی بەهێزیان بۆ بانگەوازەکەی خوا پێدراوە، ئاخر بۆیە بووشنەتە میراتگری پێغەمبەران و جێی ئەو رێزەی خوای کردگارن کە بیانکاتە شوێنکەوتووی ئەو پێغەمبەرانەی دەربارەیان دەفەرموێ: (وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ أُوْلِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصارِ) ص/٤٥ واتە: ئەو بەندانەی ئێمەت لە بیر بێت: ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبی خاوەن هێزو دیدی زیت!! (الْأَيْدِي): هێزی دینداری و پاباسییە بە فەرمانی خواوە، (الْأَبْصارِ)یش دیدی بەرفراوان و زەین روونییە، لە پەیبردن بە دینی خوادا، بە أبصارەکە پەی بە حەق

دەبات و شارەزای دەبێت، بە هێزەکەش دەتوانێت بیگەێنێتەوە، ئاوا بانگەوازە خواییەکە هەڵدەگرێت: بە گەیاندنەوەو بانگێشتکردنی خەڵکی بۆی..).[1]

ئیمامی (شاطبی) یش - رحمه الله - دەفەرموێ: (زانستی هۆکارە، خۆی لە خۆیدا مەبەست نییە، بەڵکو هۆکاری کارکردنە، بۆیە هەرچی لەسەر گەورەیی و مەزنی و رێزی زانستی هاتووە لەبەر پیادەکردن و جێبەجێکردن و کارپێکردنەکەیەتی).[2]

لە لاپەڕە (٦٩)شدا دەفەرموێ: (زانستی: ئەوەیە کە لای شەرع پەسەندە - مەبەستم لەوەیە کە خواو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مەتحی خۆی و خوێندکارانی کردووە - ئەویش ئەوەیە کە دەبێتە پاڵنەرو هاندەری خاوەنەکەی بۆ کارکردن پێی. ئەوە ئەو زانستیەیە کە لێناگەڕێت خاوەنەکەی بە کەیفی خۆی هەڵسوکەوت بکات و بە حەزی خۆی کار بکات! ئەوە ئەو زانستییەیە کە خاوەنەکەی - خۆشیی بێ و ترشیی بێ - ناچار دەکات پێوەی پابەند بێت).. لەمانەوە ئەوە دەردەکەوێت کە ئەو زانایانەی بەڵگەکان لەسەر مەتح کردنیانن، ئەوانەن کە کار بە زانینەکەیان دەکەن..

دواى ئەم پێشەکیە دەڵێین کە بەڵگەی قورئان و سوننەت لەسەر گەورەیی زانستی شەرعی و بەڕێزی خوێندکارو مامۆستایان و پابەندو پەیڕەوانی زۆرە، لەم

---

[1] مجموع الفتاوى/ ٩٣:٩٢/٤

[2] الموافقات ٦٥/١ چاپی (دارالمعرفة).

کتێبەدا چوار باس هەیە، دوانیان ئەو بەڵگانە روون دەکەنەوە، سێیەمیشیان راوبۆچوونی هەندێك لە زانایانی سەلەفە، لە چوارەمیشدا پلەو ئاستی خەڵکی لەم رێزو قەدرەیاندا روونکراوەتەوە، هەموویان بەم شێوەیەن:

باسی یەکەم: بەڵگەی قورئان لەسەر گەورەیی زانست و زانایانی.

باسی دووەم: بەڵگەی فەرموودە لەسەر گەورەیی زانست و زانایانی.

باسی سێیەم: رای سەلەفی ساڵح لەسەر گەورەیی زانست و رێزی زانایانی.

باسی چوارەم: ئاستی خەڵکی لە شایانێتی ئەو رێزەی زانایاندا.

با بە پشت و پەنای خوای گەورە دەست بە باسی مەبەست بکەین..

## باسی یەکەم

### بەڵگەی قورئان لەسەر گەورەیی زانست و زانایانی

١- ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ * قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ * قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ) البقرة ٣١- ٣٣ واتە: ئیتر خوای گەورە ئادەمی فێری هەر هەموو ناوەکان کردو پاشان خستیە پێشچاوی فریشتەکان و پێی فەرموون: دەی ئەگەر ڕاست دەکەن ناوی ئەوانەم پێ بڵێن! ئەوانیش فەرموویان: پاك و بێخەوشیی بۆ تۆیە خوایە، ئێمە هیچ زانیاریەکمان نیە جگە لەوە کە خۆت پێت بەخشیووین، تۆش زاناو دانایت. فەرمووی: ئادەی ئادەم ناوەکانیان پێ بڵێ، کە ناوەکانی پێفەرموون، فەرمووی: ئەدی پێم نەووتن کە من نادیاری ئاسمانەکان و زەوی دەزانم؟! ئەوەش دەزانم کە ئێوە ئاشکرای دەکەن و ئەوەش کە پەنهانتان کردبوو ..

قورتوبی دەفەرموێ: خوای گەورە کە دەفەرموێ: (قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ) واتە: ئادەی ئادەم ناوەکانیان پێ بڵێ، ئەمە پێنج باسی لە خۆ گرتووە:

یەکەم: لە (أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ) ناوەکانیان پێ بڵێ، تا فەزڵ و گەورەیی ئادەمیان نیشاندا، تا بزانن کە لەوان زاناترەو پلەو پایەی لای خوای گەورەی بەرزە، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لەوان بەرێزترە بۆیە پێش ئەوانی خست و پێی فەرموون کە

کرنووشی بۆ ببەن، تا ببنە قوتابی ئەو، تا لەوەوە فێربن، چونکە بەو زانیاریە تایبەتیەی دەیزانی ئەو پلەو پایەو رێزەی دەسکەوت کە بگاتە ئەوەی کرنووشی بۆ ببرێت!

دووەم: ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی زانستی و زاناو فێرخوازان، لە فەرموودەشدا هاتووە: (إنَّ الملائكةَ لَتَضَعُ أجْنِحَتَهَا رِضَاً لِطَالِبِ العِلْمِ) واتە: فریشتەکان باڵیان رادەخەن بۆ فێرخوازانی زانستی، مەبەست لەوەیە کە خۆبەکەم دەزانن لە بەرامبەریاندا، ئەمەش لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا تەنها بۆ ئەهلی زانستیە شەرعیەکە دەکەن، چونکە خوای گەورە لە سەردەمی ئادەمەوە ئاوای راهێناون و فەرمانی ئەو رەفتارە جوانەی پێکردوون کە دەبێت بەرامبەر بە زانایان ئاوا بە ئەدەب بن!! جا هەر زانستیەك لە مرۆڤێکدا دەرکەوێت ئەم فریشتانە ئاوا بە رێزەوە بۆی دەوەستن و رازی دەبن کە لە خزمەتیدا بوەستن و دوعای بۆ بکەن! ئەمە بۆ قوتابی و فێرخوازانی زانستە، ئەدی دەبێ بۆ زانایان و شارەزایانی خواناس چۆن بن؟! فەزڵی خوای گەورە زۆرە، بە لوتفی خۆی ئێمەش و ئێوەش بخاتە ریزیانەوە..[١]

٢- ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە تێیدا دەفەرموێ: (وَأَنزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا) النساء/١١٣ واتە:

[١] تفسير القرطبي ١/٢٨٨- ٢٨٩

خوای گەورە قورئان و سوننەتی بۆ ناردوویتە خوارەوە (چونکە رەفتارو هەڵسوکەوتی خۆشت بە ئاراستەی ئەو دەکەیت) هەموو ئەوانەشی فێر کردوویت کە نەتدەزانین، بەڕاستی فەزڵی خوای گەورە لەسەرت زۆرە..

دەقی ئایەتەکە خۆی بەڵگەی فەزڵ و رێزی فێرخوازانە، چونکە دەفەرموێ: (وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ) واتە: هەموو ئەوانەشی فێرکردوویت کە نەتدەزانین، پاشان ئەم فێرکردنەشی بە فەزڵێکی گەورە وەسف کردووە کە فەرموویەتی: (وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا) واتە: بەڕاستی فەزڵی خوای گەورە لەسەرت زۆرە ..

خوای گەورە هەر وەکو کە باسی ئەم فەزڵەی خۆی بۆ سەیدنا محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کردووە، باسی ئەو فەزڵی فێرکردنەی خۆی بۆ پێغەمبەرانی دیکەش کردووە. دەرهەق سەیدنا ئیبراهیم دەفەرموێ: (يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا) مريم/٤٣ واتە: بابە گیان، بە تەئکید من ئەوەندەم زانیاری بۆ هاتووە کە بۆ تۆ نەهاتووە، دەی سا شوێنم کەوە تا هیدایەتی رێی راستت بدەم. دەربارەی سەیدنا یەعقووب دەفەرموێ: (وَإِنَّهُ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَاهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ) یوسف/٦٨ واتە: بە راستی ئەو خاوەن ئەو زانستە بوو کە فێرمان کردبوو، بەڵام ئەوەیە کە زۆرینەی خەڵکی نازانن.. دەرهەق سەیدنا یوسفیش دەفەرموێ: (وَكَذَلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ) یوسف/٦ واتە: هەر بەو شێوەیەش خوای گەورە هەڵت دەبژێرێت و فێری لێکدانەوەو پەی پێبردنی هۆکارو ئەنجامی رووداوەکانت دەکات.. دەربارەی سەیدنا داوودیش دەفەرموێ: (وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاء)

البقرة/٢٥١ واته: خوای گەورە دەسەڵات و دانایی ئیداریی پێ بەخشی و ئەوەی خۆی حەزی دەکرد فێری کرد! دەربارەی سەیدنا سولەیمان دەفەرموێ: (وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ) النمل/١٦ واته: سولەیمان میراتەکەی داوودی پێبڕاو گرتیه دەست، ئیدی بە خەڵکەکەی فەرموو: هۆ خەڵکینە، ئێمە فێری زمانی دووان و دوواندنی باڵندەش کراوین و زانیاری هەموو شتێکیشمان دراوەتێ! ئا ئەمە فەزڵ و ڕێزی ئاشکراو دیارە!! بۆ سەیدنا عیساش دەفەرموێ: (إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ) المائدة/١١٠ واته: كە خوای گەورە فەرمووی: ئەرێ عیسای کوڕی مەریەم، یادی ئەو فەڕو نیعمەتە بکە کە بەسەر خۆت و دایکتدا ڕشتوومە! کە بە جوبرەئیل پشتم گرتیت و وام لێکردیت بتوانیت لەسەر بێشکە وەکو سەردەمی پێگەیشتنت بێیتە قسەو بدوێیت، ئینجا فێری زانست و داناییم کردیت و تەورات و ئینجیلم فێر کردیت!

خوای گەورە هەر وەکو کە باسی نیعمەتەکانی خۆی دەفەرموێ کە بەسەر پێغەمبەرانیدا ڕشتووە، کە یەکێك لەوانە زانستیە، ئاواش باسی ئەو نیعمەتانە دەکاتەوە کە بەسەر پیاوچاکانی شوێنکەوتووی ئەو پێشەوا مەزنانەیدا ڕشتووە کە ئەوانیشی فێری شت کردووە، وەك دەفەرموێ: (لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ

وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ) ال عمران/١٦٤ واتە: بە راستی خوای گەورە نیعمەتی زۆری بە موسوڵمانان بەخشی کە لە ناو خۆیاندا پێغەمبەرێکی لێ هەڵبژاردن تا ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێنێتەوەو پەروەردەی راست و رەسەنیان کات و قورئان و سوننەتیان فێرکات، کە پێشتر لە گومڕاییەکی تەواو ئاشکرادا بوون..

٣- ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا) طه/١١٤ واتە: بڵێ خوایە زانستیم زیاتر کە ..

بوخاری رەحمەتی خوای لێ بێت لە سەحیحەکەی خۆی لە سەرەتای (کتاب العلم) لە (باب فضل العلم) دا ئەو ئایەتەی سەرەوەی هێناوەتەوەو ئیمامی ئیبنوحەجەری رەحمەتیش دەربارەی ئەوە لە راڤەیدا فەرموویەتی: ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە (وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا) بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر فەزڵ و رێزی زانستی، چونکە خوای پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەرە نازادارەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە هیچ شتێکدا جگە لە زانستی نەکردووە کە زیاتری لێ داواکات، مەبەستیش لەو زانستیە، زانستی شەرعییە، ئەو زانستیەی کە ئەو ئەرکانە بۆ موسوڵمان روون دەکاتەوە کە یارمەتی دەدات لە زانینی ئەحکامی دینەکەی و خواپەرستی و زانینی سنورەکانی شەرع و چۆنیەتی مامەڵە کردنی، هەروەها ناسینی خوای گەورە و زانینی سیفاتەکانی و ئەو پاك و بێ خەوشییەی

کە موسوڵمان دەبێت بۆ خوای گەوەری بڕیار بدات، چوارچێوەی ئەمانەش زانستیەکانی تەفسیرو فەرموودەو شەرعناسییە ..[1]

٤- ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە تێیدا باس لە سەیدنا مووساو غولامەکەی دەکات کە لە خزمەتیدا بوو، پاشان سەیدنا خدریان بینی کە دەربارەیان دەفەرموێ: (فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا. قَالَ لَهُ مُوسَى هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا) الكهف٦٥- ٦٦ واتە: بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان دیت، کە لە لایەن خۆمانەوە رەحمەتێکمان دابوویەو زانستیەکمان لە لایەن خۆمانەوە فێرکردبوو، مووسا پێی فەرموو: ئەرێ رێم دەدەیت شوێنت کەوم تا لەو زانیاریەی فێرکراویت شتێکت لێوە فێر بم و بگەمە پلەی پەیپێبردن؟!

ئەم ئایەتانەی دەرهەق سەیدنا مووساو سەیدنا خدرن، هەر وەکو ئایەتەکەی پێشوو کە دەرهەق پێغەمبەری پێشەوای خۆمانە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا) چونکە سەیدنا مووساش هەر داوای زانستی زیاتر دەکرد، ئەگەرچی لە کەسێکیشەوەیە کە پلەو ئاستی فەزڵ و گەورەیی لە خۆی کەمتریش بووبێت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێ: (بَيْنَمَا مُوسَى فِي مَلَإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْكَ قَالَ مُوسَى لَا ، فَأَوْحَى اللَّهُ عَزَّ

---

[1] فتح الباري ١٤١/١.

وَجَلَّ إِلَى مُوسَى بَلَى عَبْدُنَا خَضِرٌ. فَسَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَيْهِ.فَجَعَلَ اللَّهُ لَهُ الْحُوتَ آيَةً وَقِيلَ لَهُ إِذَا فَقَدْتَ الْحُوتَ فَارْجِعْ فَإِنَّكَ سَتَلْقَاهُ. وَكَانَ يَتَّبِعُ أَثَرَ الْحُوتِ فِي الْبَحْرِ. فَقَالَ لِمُوسَى فَتَاهُ أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهِ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ قَالَ ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصَا فَوَجَدَا خَضِرًا فَكَانَ مِنْ شَأْنِهِمَا الَّذِي قَصَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي كِتَابِهِ)[1] البخاری واته: لەو کاتەی مووسا علیه السلام لە ناو کۆمەڵێك لە بەنی ئیسرائیلیانی قەومەکەی خۆیدا بوو، کابرایەك هاتە خزمەتی و لێی پرسی: کەسێکت پێ شك دێت لە خۆت زاناتر بێت؟! مووسا فەرمووی: نەخێر، ئیدی خوای گەورە وەحی بۆ نارد کە بەڵێ هەیە، بەندەکەی خۆمان کە ناوی خدرە! ئیدی مووسا داوای لە خوای گەورە کرد کە ڕێی دیداری ئەویی نیشان دا، خوای گەورە ماسیەکەی بۆ کردە نیشانەو پێی ووترا: بڕۆ، لە هەر کات و شوێنێك ئەم ماسیەت لێ وونبوو، بگەڕێرەوە ئەوە خدر لەوێیەو دەیبینیت، لە جێیەك ماسیەکەیان لێ وونبوو، هەر ئاسەوارێکی لێجێما (پاشان کە سەیدنا مووسا بە غولامەکەی فەرموو: ماسیەکەمان بۆ بێنە) غولامەکەی ووتی: دەزانیت ماسیەکەم لای تاوێرە بەردەکەی کە لاماندا بیرچوو، شەیتان بیری بردمەوە پێت بڵێم، مووسا فەرمووی: ئێ ئەمە مەبەستەکەمانە، ئیتر بە شوێن پێی خۆیاندا گەڕانەوە لای تاوێرە بەردەکە، خدریان لەوێ بینی، باقی چیرۆکەکەش ئەوەیە کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا بۆی گێڕاوەنەتەوە .

[1] **بوخاری** (٧٨، ١٢٢، ٢٥٧٨، ٣١٠٤، ٤٤٤٨ - ٦٢٩٥، ٧٠٤٠).

ئەمە بەڵگەیەکی راشکاوو رۆشنە لەسەر گەوەریی و فەزڵی زانست و فێربوون، کە دەبینی سەیدنا مووسا کە یەکێکە لە ناوداری پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت کە لە خاوەن وویستە بەرز (اولو العَزم)ە کانە، لە پێناوی وەرگرتنی زانست و فێربووندا دەڕواتە لای کەسێکی دیکە کە سەیدنا خدرە، کە لە فەزڵ و گەورەییدا لە خۆی کەمترە..

ئیبنوحەجەر لە بەراووردکردنی فەزڵی هەردووکیاندا سەلامی خوایان لێ بێت، دەفەرموێ: سەیدنا خدر هەرچەندە پێغەمبەرە بەڵام زانایان راکۆن لەسەر ئەوەی کە خاوەن پەیام (رسول) نەبووە،[1] خاوەن پەیامیش گەورەترە لە نێرراوی بێ پەیام، تەنانەت ئەگەر بشووترێت کە سەیدنا خدر پێغەمبەری خاوەن پەیام بووە، هەر ناگاتە ئاست و پلەی سەیدنا مووسا، کە پەیامەکەی گەورەترو ئوممەتەکەشی زیاتر بوون، ئەگەر سەیدنا خدر پێغەمبەرێکی بەنی ئیسرائیل بێت، دیسان سەیدنا مووسا هەر پێغەمبەرێکی ئەوانەو سەرکردەیانەو لە هەموو

---

[1] پێغەمبەرانی خوا سێ پۆلن: پۆلی یەکەم: ئەوانەی هەر وەحیان بۆ هاتووەو لە نێوانی دوو پێغەمبەری خاوەن پەیامدا هاتوون بۆ میللەتان تا بیانخەنەوە سەر رێبازی پێغەمبەرەکەی پێشوو، وەکو ئەو پێغەمبەرانەی لە نێوان سەیدنا موساو سەیدنا عیسادا بۆ بەنی ئیسرائیل نێرراون. پۆلی دووەم: ئەوانەی کە پەیامی سەربەخۆیان بۆ هاتووە، وەکو سەیدنا شوعەیب و سولەیمان و ئەو بەرێزانەی دیکە. پۆلی سێیەم: پێشڕەوانی پێغەمبەرانن کە پێنجی خاوەن وویست و ئیرادەی بەرزیان پێیان دەوترێت (اولو العزم) کە بریتین لە سەیدنا نوح و ئیبراهیم و موساو عیساو محمد سەلامی خوای گەورە لە هەموان.. ( و).

پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل گەورەترە، ئەگەر بشڵێین سەیدنا خدر پێغەمبەر نەبووەو هەر وەلیەکی خوابووە، ئەوە دیسان ئاشکرایە کە پێغەمبەرێك لە وەلیەك گەورەترە، گەورەیی پێغەمبەرێك لە وەلییەك بەڵگە نەوویستێکی ژێرییاری و شەرعی ڕۆشنەو ئەوی پێچەوانەی ئەوە بڵێت بەرەو کوفر چووە، چونکە ئەوە لە ڕێسا نەگۆڕەکانی شەرعە.[1]

٥- ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێ: (شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) ال عمران/١٨ واتە: خوای پەروەردگارو فریشتەکان و خاوەن زانستەکان شایەتیانداوە کە جگە لە (الله) هیچی دیکە خوا نیە، هەمووشیان دادی خوایی دەچەسپێنن، بە ڕاستی هیچ شتێك نیە شایانی ئەوە بێت بە خوا دانرێت جگە لە الله، خوای گەورە بە دەسەڵات و دانایە .

ئیبنولقەییم رحمە الله دەفەرموێ: لەم ئایەتەدا خوای گەورە شایەتی خاوەن زانستەکان لەسەر تاکێتی خۆی دەهێنێتەوە کە دەفەرموێ: (شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ) ئەمە لە چەند لایەنێکەوە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و فەزڵی زانست و ئەهلی زانستی: یەکەمیان: پەسەندکردنی شایەتیەکەی ئەوان لە نێوان ئەو هەموو خەڵکەدا کە هەن! دووەمیان: هێنانی شایەتیەکەی ئەوان لە ریزی شایەتیەکەی خۆی. سێیەمیان: ریزیکردنی شایەتی ئەوان لەگەڵ شایەتی فریشتەکانی خۆی. چوارەمیان: ڕێزلێنانیان بە ناساندنیان

---

[1] فتح الباري (١/٢٢١).

بەوەی کە دادپەروەرن، چونکە شایەت دەبێ دادپەروەرو سەرڕاست بێت، ئەمەش تەزکیەی خوای گەورەیە بۆ ئەوان! ئیتر چ تەزکیەو وەسفێك لەمە گەورەترە؟! نابینیت پێغەمبەری نازدار صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەرهەق زانایان دەفەرموێت: (يَحْمِلُ هَذَا العِلْمَ مِنْ كُلِّ خَلَفٍ عُدُولُهُ، يَنْفَوْنَ عَنْهُ تَحْرِيفَ الغَالِينَ وانْتِحَالَ الْمُبْطِلِينَ وتَأْوِيلَ الْجَاهِلِينَ)[1] واتە: ئەم زانستیە لە هەر نەوەیەك دادپەروەرانی هەڵیدەگرن، لارێبوونی توندڕەوان و خۆبەشیاوزانی گەندەڵان و لێکدانەوەی نەفامانی لێ لادەبەن.. تا دەگاتە: شەشەمیان: پاشان خوای گەورە بۆ خۆی دەبێتە شاهیدا! کە شیاوترین و لێزانترین و بەڕێزترین شایەتەو ئینجا فریشتەو خاوەن زانستیەکان باس دەفەرموێ.. بە تەئکید ئا ئەمە فەزڵ و پلەو ڕێزە ..[2]

قورتوبی رحمه الله دەفەرموێ: ئەم ئایەتە بەڵگەی گەوەریی و گرنگی زانست و پلەو ڕێزی زانایانی تێدایە، ئەگەر کەسانێکی دیکە لە ئاستی زانایاندا بوونایە

---

[1] ئیبنو عەدی لە سەیدنا علی و عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت گێڕاوێتیەوە، هەروەها خەتیبی بەغدادیش لە موعازەوە،تەبەریی لە ئوسامەی کوری زەیدەوە، هەروەها لە ئەبو هورەیرەو ئیبنومەسعودەوە هاتووە، ئیمام ئەحمەد دەفەرمووێت: فەرموودەیەکی صەحیحە. (خەللال لە کتێبی (العلل) هوە لێوەی گێڕاوێتیەوە، وەکو ئیبنولقەییم لە کتێبی (مفتاح دارسعادة ١٣٦/١) وخەتیبی بەغدادیی لە ئیمام ئەحمەدەوە هێناوێتیەوە. بڕوانە: کتێبی (شَرَفُ أصحاب الحديث ل٢٩).

[2] مفتاح دارالسعادة (٤٩).

حەتمەن خوای گەورە دەیهێنانە ریزی ناوی پیرۆزی خۆی و فریشتەکانیەوە ..[1]
ئەبوحامیدی غەزالی رەحمەتیش قسەیەکی وەکو ئەمەی هەیە ..[2]

٦- هەروەها ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: (أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاء اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ) الزمر/٩ واتە: چما ئەو کەسەی لە تاریکی شەواندا ملکەچانە لە سوجدەدایەو خەریکی شەونوێژێتی و هۆشی لە چارەنووسی قیامەتێتی، وەك ئەو کەسەیە کە هاوبەشی بۆ خوای گەورە داناوە؟! چما ئەو کەسانەی دەزانن کە خواناسي و خواپەرستي چییە، وەکو ئەوانەن کە نازانن؟! ئەوانەی خاوەن هزرو ژیرین پەی بەم جیاوازیی زانینە دەبەن ..

ئیبنولقەییم رحمه الله دەفەرموێ: خوای پەوەردگار جیاوازیی خستۆتە نێوان ریزی ئەو کەسانەوە کە زاناو ئەهلی خواناسي و خواپەرستین، لەگەڵ ریزی ئەو کەسانەدا کە وا نین. هەروەکو کە جیاوازی خستۆتە نێوان ئەهلی بەهەشت و ئەهلی دۆزەخەوە کە فەرموویەتی: (لا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ) الحشر/٢٠ ئەمە بەڵگەیە لەسەر پلەی بەرزو رێزی زانایان.[3]

٧- ئەو ئایەتەش کە دەفەرموێ: (أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ) الرعد/١٩ واتە: چما ئەو کەسەی کە دەزانێت

---

[1] تفسير القرطبي (٤١/٤).
[2] احياء علوم الدين (١٥/١).
[3] مفتاح دار السعادة (٤٨-٤٩).

ئەمە وەحییەو حەقەو لە خوای پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە وەکو ئەو کەسەیە کە کوێرە؟! ئاخر ئەو کەسە پەی بەمە دەبات کە خاوەن هزرو ژیرییە.

ئیبنولقەییم رحمه الله دەفەرموێ: (خوای گەورە نەزانی خستۆتە ریزی کوێرو نابیناکانەوە، کە توانای دیتنیان نییە! نابینیت چۆن دەفەرموێ: (أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى) چونکە خەڵکی دوو پۆلن: زاناکان و کوێرەکان. خوای گەورە لە زۆر شوێنی قورئاندا نەزانەکانی بە کوێرو کەرِو لاڵ وەسف کردووە.[1]

٨- ئەو ئایەتەی تریش کە دەفەرموێ: (وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلا الإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) الشورى/٥٢ واتە: ئێمە رۆحێکمان لە تەرەفی خۆمانەوە بۆ ناردویت، کە پێشتر نەتدەزانی قورئان و وەحی چین و باوەرِو ئیمانداریی چین، ئێمە وەحیەکەمان کردە نووری رێ تا ئەو عەبدانەمانی پێ هیدایەت بدەین کە دەخوازیین رێنمایی خوایی وەربگرن. دڵنیابە جەنابیشت خەڵکی بۆ رێبازی راست و دروستی خوایی بانگهێشت دەکەیت.

دەبینیت خوای گەورە ئەوەی کە بە وەحیی ناردوێتی بە (نوور: تیشکی روناکیی) وەسفی دەکات، ئاشکرایە ئەوەی کە بە وەحییەکەی بۆ جەنابی ناردووە زانستییە:

---

[1] هەمان سەرچاوە (٤٩).

خواناسیی و خواپەرستییە. وەك دەفەرموێ: (فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ) ئال عیمران/٦١ واتە: ئەوی دوای ئەوەی کە زانستییت بۆ هاتووە موناقەشەت لەگەڵدا دەکات.. بۆیە کاتێك کەسێك پشکی زیاتری لەم زانستییە بەردەکەوێت پشکی زیاتریی لەو نوورە خواییە پێدەبرێت بەو نوورەش- کە هیدایەتە خواییەکەیە- حەق و باتڵ دەناسێت و سنووری نێوانیان لێك جودا دەکاتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: (أَوَ مَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا) الانعام/١٢٢ واتە: چما ئەو کەسەی مردوو بووەو ئێمە زیندوومان کردۆتەوەو نوورێکمان خستۆتە بەرچاویی و بەوە رێی راستی لە ناو خەڵکییدا دۆزیوەتەوەو پێی دەڕوات، وەکو ئەو کەسەیە کە لە تاریکستانییەکی چڕدایەو ناتوانێت لێی قوتار بێت؟! ئەمە ئەو زانستییە شەرعییەیە کە خاوەنەکەی بەرەو تەقواکاریی و لەخواترسان دەبات. خوای گەورە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)الحديد/٢٨ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوای گەورە بترسن، باوەڕ بە نێرراوەکەی بهێنن دوو پشکی زەمانەتتان بۆ مسۆگەر دەکات (کە چاودێریی کردنتانە لە دنیاو لە قیامەتدا)و نوورێکیشتان پێ دەبەخشێت کە مایەی بەرچاوڕوونیتان دەبێت و لێشتان خۆش دەبێت.. خوای گەورە لێخۆشبوو و بەبەزەییە.

٩- ئەو ئایەتەش کە دەفەرموێ: (قَالُواْ اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ هُوَ الْغَنِيُّ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَانٍ بِهَذَا أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ

تَعْلَمُونَ)یونس/٦٨ واتە: دەیانووت کە خوای گەورە کوڕی بۆ خۆی هەڵبژاردووە! خوای گەورە بێنیازە، پێویستی بە هیچ نییە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندان موڵکی ئەون، دەی ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان لەسەر راستی ئەو قسەیەتان پێیە؟ یان هەر لە خۆتانەوە - بێ ئەوەی هیچ بزانن - لە وەسف و سیفەتی خوای گەورەوە دەدوێن..

خوای گەورە لەم ئایەتەدا زانست و بەڵگەی بە (سُلْطَان) ناوبردووە، داوای لە کافرەکان کردووە کە بەڵگەی راست لەسەر قسەکانیان بهێننەوە، (إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَانٍ) بە تەئکیید نیشیانە. ئینجا ئەو هەڵوێستەیانی رەتکردۆتەوە کە بە بێ هەبوونی زانیاریی قسە لەسەر سیفاتی خوای گەورە دەکەن: (أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ).

ئایەتێکی تری هەر وەکو ئەمە: (أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاءٍ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا نَزَّلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ) الاعراف/٧١ واتە: ئەو موناقەشەیەم لەسەر ناوو سیفات و وەسفی (بتە خوا)کانتان لەگەڵدا دەکەن کە هەر لە خۆتان و باب وباپیرانتانەوە هێناوتانەو خوای گەورە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر راستێتی نەناردووە.. هەروەها ئایەتی: (هَؤُلاء قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّوْلا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا) الکهف/١٥ واتە: (یاوەرانی ئەشکەوت فەرموویان) ئەم قەومەی ئێمە بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی راست و رەوایان هەبێت، خوای تریان لە جیاتی خوای پەوەردگار داناوە! ئێ کێ لەو کەسە

ستەمکارترە کە کە قسەی درۆ بە ناوی خوای گەورەوە هەڵدەبەستێت؟! هەروەها ئایەتی: (وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ) الحج/٧١ واتە: خوای تر لە جیاتی خوای پەروەردگار دەپەرستن کە هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر راست و رەوایی دیدو هەڵوێستیان نییەو هیچ زانستییەکیشیان لەو بارەوە (لەسەر خواناسیی و خواپەرستیی) نییە!! هەروەها ئایەتی: (أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ * وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ) الصافات/١٥١-١٥٢ واتە: ئەوەتا لەبەر ئەو درۆو هەڵبەستانەی بە ناوی خواوە دەیکەن، دەڵێن خوای گەورە کوڕی هەیە. بە تەئکیید درۆ دەکەن، هەر درۆزنن .

ووشەی (سُلْطَان) لە هەموو ئەم ئایەتانەدا هەر بە مانای بەڵگەی شەرعیی هاتووە، واتە هەبوونی زانست و هەنجەت (بەڵگە).. زەمی موشریکەکانیشی کردووە، کە لەبەر نەبوونی بەڵگەو هەنجەتی وەحی کەوتوونەتە شیرکەوەو هاوبەشیان بۆ خوای گەورە داناوە. داوای لێکردوون کە ئەگەر خۆیان وا دەبیین کە خواناسییەکەیان راستەو لەسەر هەقن با بەڵگەیەك لە وەحیی خوایی لەسەر دیدو هەڵوێستیان بهێننەوە ..

**بیرخستنەوەیەك:**

ووشەی (سُلْطَان) لە قورئاندا بە دوو مانا هاتووە :

یەکەمیان: بە مانای بەڵگەو هەنجەتی راست و دروست (لە وەحی خواییەوە هاتبێت) وەکو لەو ئایەتانەی پێشوودا روونبۆوە .

دووەمیان: بە مانای هێزو توانا. وەکو کە خوای گەورە دەفەرموێ: (وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا) الإسراء/٨٠ واتە: هەر لە تەرەفی خۆشتەوە هێزو توانایەك بکە بە پشتیوانم.. هەروەها: (وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا)الإسراء/٣٣ واتە: هەر کەسێك ستەملێکراوانەوە بکوژرێت، ئەو ماف و هێزو دەسەڵاتەمان داوە بە سەرپەرشتیارە (خاوەن خوێن)ەکەی کە مافی بسەنێتەوە.

لە قورئاندا ووشەی (سُلْطَان) زیاتر بە مانای یەکەمین هاتووە. هەردوو ماناکەش هەر دەگەڕێنەوە بۆ یەك ئەسڵ کە (السَّلاطة) یە واتە: هەبوونی تواناو دەسەڵاتێك کە بتوانێت بەرامبەرەکە بخاتە ژێر دەستی خۆی و بەسەریدا زاڵ ببێت. جا بەبەڵگەو هەنجەتی راست و رەوا بێت یان بەبەکارهێنانی هیزی ماددی.[1]

ئیبنولقەییم رحمه الله دەفەرموێ: (مەبەست ئەوەیە کە خوای گەورە زانستیی بەڵگەی ناوناوە (سُلْطَان) چونکە ئەوە وا دەخوازێت کە خاوەن بەڵگەکە بە تواناوە هەنجەتی راست و رەوای خۆی بەسەر نەزاناندا فەرزکات، چونکە دەسەڵاتی بەڵگەی حەق لە هێزی دەست و دەسەڵاتی بەرجەستە (ماددیی) گەورەترو کاریگەرترە، نابینیت:

[1] المفردات للراغب الأصفهاني، ل ٢٣٨.

١- خەڵكی تەسلیم بە بەڵگە دەبن و شوێنی دەكەون كەچی لە دەسەڵات هەڵدەگەڕێنەوەو لێی یاخی دەبن ..

٢- خەڵكی كە بەڵگە وەردەگرن بە دڵ تەسلیمی دەبن، كە دەكەونە ژێر قەهری هێزەوە هەر بە بەدەن تەسلیمی دەبن ..

٣- بەڵگە دڵ كەمەندكێش دەكات و دەیخاتە شوێن خۆی، بەرامبەرەكەشی هەرچەندە كەللەڕەقیی بكات و لە رواڵەتدا خۆی بەدەستیەوە نەدات، لە ناخی دڵ و دەروونییدا پێی حەق دەبێت و ناچارانەو زەلیلانە تەسلیمی دەبێت! لە بەرامبەردا بڕوانە دەسەڵاتی هێزو پلەو پایە، ئەگەر بەڵگەی حەقی لەگەڵدا نەبێت تا بە شەرعێتیەكەی ئەوەوە خەڵكی ئاڕاستە بكات، هەر دەبێتە كەڵبەو چڕنووك و چەپۆكی دڕندان! دەبێتە هێزی بێ زانست و بێ بەڵگەی رەواو بێ رەحم و رەدا. بە پێچەوانەی هێزی هەنجەت و بەڵگەی حەق كە دەبێتە هێزی زانست و دانایی و هێزی و بەزەیی و رێنیشاندان..[1]

لەبەر ئەوەی زانست هێزو سوڵتانە، خاوەنەكانی - كە زانایانن - خاوەن هێزی حەقیقیین، سەرۆكایەتی و پێشڕەوێتی و ئاڕاستەوانێتی حەقیقیی خەڵكی وا بەوان. ئەبولئەسوەدی دوئەلی خوا لێی رازی بێت دەیفەرموو: (هیچ شتێك وەكو زانست

---

[1] **مفتاح دار السعادة** ٥٩/١. خاڵبەندییەكەی من كردومە (ك).

بەنرخ نییە، پاشاكان دەسەڵاتدارانی سەر خەڵكین، بەڵام زانایان دەسەڵاتدارانی سەر پاشاكانن).[1] لەوانەی ئەم راستییە دەسەلمێنێت :

١٠- هەروەها ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێ: (وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ) النساء/٨٣ واتە: هەر كە هەواڵێك (ئیدیعایەیەك)یان پێدەگات. چ دەربارەی ئەمن و ئەمان بێت، چ دەربارەی دژواریی و مەترسیی بێت. بێ سێوودوو (بێ توێژینەوەو بەدواداچوونەوەی) یەكسەر دەكەونە ژێر كاریگەرێتی ئەو قسەیەوەو هەر خۆیان دەكەونە بڵاوكردنەوەی! ئاخر ئەگەر بە پێغەمبەری خوایان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و بە بەرپرسانی خۆیانیان بگەیاناىەتەوە، ئەوان مەبەست و ئامانجی ئەو قسەیان دەزانی و دەیانزانی حوكمی ئەو قسەیە چییەو دەبێ چ رایەكی بەرامبەر دەرببڕن ..

ئەمە دەقێكی رۆشنەو ئەوە دەسەلمێنیت كە زانایانی بەرپرس - كە بەوە وەسفی كردوون (الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ)- مەرجەعییەتی ئاڕاستەكردنن و دەبێ هەواڵی هەموو روداوو پێشهاتێك بگێڕرێتەوە لای ئەوان و حوكمی هەموو رەفتارێك دەبێ لەوانەوە دەرچێت. بۆیە ئیبنوتەیمییە رحمه الله دەفەرموێ: (زانایان و دەسەڵاتداران ئەو (كاربەدەست: وەلی ئەمر)ەی موسوڵمانانن كە خوای گەورە دەربارەیان فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُولِي

---

[1] إحياء علوم الدين ١/ ١٨.

الأَمْرِ مِنكُمْ) النساء/٥٩ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوای گەورەو گوێڕایەڵی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و کاربەدەستانی خۆتان بکەن. ئیبنوتەیمییە رحمە اللە دەفەرموێ: (بۆیە کاربەدەستان کراون بە دوو پۆل: زانایان و دەسەڵاتداران. هەر کاتێك ئەمانە چاك دەرچوون خەڵکیش چاك دەبن. ئەگەر ئەمان خراپ دەرچوون خەڵکیش خراپ دەبن).[1] ماناکردنی (ولی الامر) بە زانایان و کاربەدەستان لە یاوەرانەوە هاتووە. ئیبنوحەجەر رحمە اللە دەفەرموێ: (راجوێییەك لە ماناکردنی (أُولِي الأَمْرِ)ی ئایەتەکەدا هەیە.

ئەبوهورەیرە خوا لێی رازی بێ دەفەرموێ: (الامراء): واتە: کاربەدەستانن.[2] جابری کوڕی عەبدالله خوا لێی رازی بێت دەفەرموێ: (هم أهل العلم والخير) واتە: زانایان و خێرخوازانن. موجاهیدو عطاء و حەسەنی بەسریی و ئەبولعالییە دەفەرموون: زانایانن.[3]

١١- لە گەورەیی زانستە کە: چاکەو گەورەیی و رێزی زانست دەگاتە گیانلەبەرانیش! خوای گەورە هەر وەکو کە کەسی زانای وەکو کەسی نەزان دانەناوەو یەکسانی نەکردوون، سەگی زاناو سەگی نەزانیشی یەکسان نەکردوون. ئیبنولقەییم لە روونکردنەوەی ئەوەدا دەفەرموێ: (خوای گەورە نێچیری سەگی

---

[1] مجموع الفتاوى ٢٨/١٧٠ هەروەها (مجموع الفتاوى ب ١٠/ ٣٥٤.٣٥٥ و ب ١١/ ٥٥١ ٥٥٢.)

[2] تەبەریی لە مەیموونی کوڕی مەهرانەوە بە سەنەدێکی سەحیح ریوایەتی کردووە.

[3] فتح الباري ٨/ ٢٥٤.

نەزانی بە مردارەوەبوو داناوەو خواردنیشی حەرام کردووە، کەچی نێچیری سەگی فێرکراوی بە حەڵاڵ داناوە.. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر گەورەیی زانست و بەڕیزیی خوێندکارانی.. خوای گەورە دەفەرموێ: (يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُواْ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُواْ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ) المائدة/٤ واتە: لێت دەپرسن چییان بۆ حەڵاڵە؟ بفەرموو: هەموو شتێکی پاکتان لێ حەڵاڵە، هەروەها نێچیری ئەو گیانلەبەرانەش (وەکو سەگ و هەڵۆو هیتر) یان گیانلەبەرانی دڕەندەی کێویی (وەکو شێرو پڵنگ و هیتر) کە لەوەی خوای گەورە ئێوەی فێرکردووە فێری راوکردنتان کردوون. ئەوان هەرچییەکیان راوکرد، ئێوە ناوی خوای گەورەییان لێ بهێنن و بیانخۆن. لە خوای گەورەش بترسن، لێپرسینەوەی خوای گەورە زۆر خێرایە ..

ئەگەر لەبەر زانین و گەورەیی زانست و ڕێزی فێرکردنی ئەو گیانلەبەرانە نەبوایە دەبوو نێچیری هەردوو لایان وەکو یەکبوونایە.[1]

ئەمە هەندێك بەڵگەی قورئان لەسەر گەورەیی زانست و پلەو پایەو ڕێزی خوێندکارانی شەرع.. ئینجا دەچینە سەر بەڵگەی ئەمە لە سوننەتدا.. ان شاء الله ..

---

[1] **مفتاح دار السعادة ٥٥/١.**

## باسی دووەم

## بەڵگەی فەرموودە

### لەسەر گەورەیی زانستی شەرعی و پلەی بەرزی فێرخوازیی

١- خاتوو عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەیفەرموو: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليه أمرُنا هذا فهو رَدٌّ) [1] واتە: هەر كەسێك كارێكی داهێنا كە دینەكەمان نەیگرێتەوە، ئەوە ڕەتكراوەیە.. ڕەفزە .

بوخاریش لە فەرموودەیەكی (موعەللەق)یدا ناونیشانێكی داناوە لە سەحیحەكەی لە (كتاب الإعتصام) دا بەناوی (باب إذا إجتهد العامل أو الحاكم فأخطا خلافاً الرسول صلى الله عليه وسلم من غير علم، فحكمه مردود لقول النبي صلى الله عليه وسلم (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليه أمرُنا هذا فهو رَدٌّ) لە شوێنێكی تریشدا بە سەنەدی پەیوەستەوە هێناوێتیەوە .

ئیبنو حەجەریش دەربارەی دەفەرموێ: (ئەم فەرموودەیە لە بنەما سەرەكییەكانی ئیسلام و ڕێسا سەرەكیەكانێتی). [2]

---

[1] بوخاری (٢٦٩٦)، موسلیم (١٧١٨) .

[2] ئیبنو حةجةري عةسقةلاني : فتح الباري (٥\٣٠٢) .

بە تەئکید هەر وایە چونکە ئەم فەرموودەیە:

أ- ماناکەی تەئکید لەوە دەکاتەوە کە هەرکارێك پێچەوانەی بەڵگەی شەرعی بوو ناڕەوایەو ڕەفزە، ئیتر لە بوارەکانی پەرستندا بێت یا سەوداو مامەڵەو گرێبەست، یا بوارەکانی تری ئەحکام وەکو ئەحکامی داوەریی.. لەم بوارانەو لە بوارەکانی تری ژیاندا هەر بڕیارو حوکمێك پێچەوانەی شەرع بێت قبوڵ نییەو خاوەنەکەی پاداشتی لەسەر وەرناگرێت ئەگەر لە (خواپەرستیدابوو) ئەگەر لە سەوداو مامەڵەو گرێبەستیشدا بێت، پابەندی شەرعیانەی لەسەر پێویست نابێت، هەروەها لە داوەریی و حوکمدا ئەگەر پێچەوانەی بەڵگەکانی شەرع بوو باتڵە و کاری پێناکرێت.

ب- ناواخنی واتای فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە: وەرگرتنی زانیاریی -پێش کارکردن - زەروورییە.. ئەگەر ڕەفتار (گوفتارو کردار) قبوڵ نەبێت تا بە گوێرەی بەڵگەی شەرعیی نەبێت، کەوابوو زانینی بەڵگەی شەرعیی پێش دەستپێکی هەموو ڕەفتارێك پێویستە. ئەمەش گەورەیی زانستی شەرعیی و زانینی بەڵگە و ئیستیدلال پێهێنانەوەی دەردەخات، کە مەرجی ڕاست و دروستی ڕەفتاری وەرگیراوەو بەڵگەی ئەوەیە کە وەرگرتنی زانست پێش دەست بەکاربوون فەرزە.

ئاشکراشە مەرجەکانی قبوڵ بوونی کردەوە دوانن:

یەکەمیان: خواوویستی و نییەتپاکی: بەوەی کە عەبد لە کارەکەیدا هیچی غەیری ڕەزامەندی خوای گەورە مەبەست نەبێت.

دووەمیان: شەرعیی بێت: واتە بەگوێرەی بەڵگەکانی شەرع بێت، ئەمەش فەرزبوونی وەرگرتنی شەرع ڕوون دەکاتەوە، تا ڕەفتارەکە لە چوارچێوەی شەرعیدا بێت و ببێتە مایەی قبوڵ بوون.

خوای پەروەردگار ئەم دوو مەرجەی لەم ئایەتەدا کۆکردۆتەوە کە دەفەرموێ: (فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلا صَالِحًا وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا) الكهف/١١٠ واتە: هەرکەسێك دەخوازێت بە ڕوو سووریی و سەرفرازیی بە دیداری خوای گەورە شاد ببێت، با کردەوەی چاك بکات، هیچ هاوبەشێك بۆ خوای پەروەردگار دانەنێت.. (وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا): مەرجی خواوویستی و سەرڕاستی و نیاز و مەبەستە پاکەکەیە. (فَلْيَعْمَلْ عَمَلا صَالِحًا): مەرجی شەرعییەتی کارەکەیەتی، هەر کە نییەتی بۆ خوا ساغ دەکاتەوە پێش دەستبەکاربوونی، دەبێت حوکمە شەرعییەکەی بزانێت پێش ئەوەی دەستی بداتێ.. ئیبنولقەییم دەفەرموێ: (هەر یەکە لە ئێمە فەرمانی پێدراوە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - لە هەموو هەواڵێکیدا کە فەرموویەتی - بە ڕاستگۆ بزانێت، دەبێت گوێڕایەڵیشی بێت لە هەر فەرمانێکیدا کە داوێتی. ئەمەش کاتێك دەبێت کە هەواڵ و فەرمانەکەی بزانرێت، خوای گەورەش بۆ پاراستنی دینەکەی و بەرژەوەندی ئوممەت و بەختەوەری ژیان و سەرفرازیی ڕۆژی دواییان فەرمانی بە پاراستنی دینەکەی داوە. بە ئیهمالکردنی دینەکە ئەو بەرژەوەندیانەی ئوممەت لە دەستدەچن و خراپەکاریی لە جێی چاکەکاریی لە ناویاندا بڵاو

دەبێتەوە، مەگەر شێواندنی دین و کارەساتە مرۆییەکانی هەموو بە هۆی نەزانینەوە نییە؟ مەگەر ئاوەدانکردنەوەشی بە زانست نییە؟

هەرکاتێك زانست لە وولاتێکدا یا لە ناوچەیەکدا بڵاوبووەوە دەبینیت خراپەکاریی تێدا کەم دەبێتەوە، بە پێچەوانەشەوە هەرکاتێك نەزانین لە وولاتێکدا یان لە ناوچەیەکدا بڵاوبووەوە، دەبینیت خراپەکاریی تێدا تەشەنە دەکات. هەر کەسێك ئەمە نەزانێت و نکوڵی لێبکات ئەوە دیارە کە خوای گەورە ڕووناکی لە بیناییدا نەهێشتووە. ئیمام ئەحمەد دەفەرموێت: ئەگەر زانست نەبوایە خەڵکی وەکو ئاژەڵیان لێدەهات. هەروەها دەفەرموێت: (خەڵك پێویستی بە زانستە زیاتر لە پێویستی خۆراك و خواردنەوە، چونکە خۆراك و خواردنەوە لە شەوو ڕۆژێکدا دوو سێجار پێویستت پێی دەبێت بەڵام زانست لە هەموو کاتێکدایە).[1]

٢- پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێ: (مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَلَا تَزَالُ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ عَلَى مَنْ نَاوَأَهُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) واتە: هەرکەسێك خوای گەورە بیەوێت تووشی خێری بکات لە دینەکە تێیدەگەیەنێت، کۆمەڵێك موسوڵمان بەردەوام - لەسەر ئەم دینە حەقە- بە ئاشکرا جیهاد دەکەن و دژی ئەوانە دەوەستنەوە کە دوژمنداریتیان دەکەن. ئەمەش تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت ..

---

[1] ئیبنولقەییمي جەوزیيە: **اعلام الموقعين** (٢/٢٣٧-٢٣٨) .

**لە ئامۆژگارییەکانی ئەم فەرموودەیە:**

أ- گەورەیی زانست و پلەبەرزیی فێرخوازیی: هەر کەسێك شارەزایی لە دینەکەیدا پەیداکرد نیشانەی ئەوەیە کە خوای گەورە خێری هێناوەتە ڕێی، با دڵخۆش بێت پێی. کە لە دینەکە تێگەیشت کارو کردەوەکانی چاك دەبن، چونکە بە پێی شەرع ڕەفتار دەکات. بە تێگەیشتنی لە دینەکەی ئامۆژگاری خەڵکی تر دەکات و ڕێنیشاندەرێتی خێرو چاکەیان دەکات. بەمەش پاداشتی وەکو بکەری خێرەکان دەست دەکەوێت.. ئەمەش هەموو پلەو ئاستی ڕێزو گەورەیین کە خوای گەورە بە هۆی بەدەستهێنانی زانستەوە پێی دەبەخشێت. بە پێچەوانەشەوە - وەکو واتای فەرموودەکە دەگەیەنێت - هەر کەسێك لە دینەکە تێنەگەیشت، ئەوە لە خێری زۆر مەحرووم بووە. ئیبنوحەجەر رحمه الله دەفەرموێ: (ئەبو یەعلا فەرموودەیەکی لە مەعاوییەوە ڕیوایەتکردووە کە لە ڕێگایەکیەوە زەعیفە، بەڵام لە کۆتایەکەیدا دەفەرموێ: (وَمَنْ لَمْ يَتَفَقَّهْ فِي الدِّينِ لَمْ يُبَالِ اللَّهُ بِهِ) واتە: هەر کەسێك شارەزایی لە دینەکەدا نەبوو خوای گەورەش بایەخی پێنادات.. ئەم مانایە ڕاستە.[1] چونکە ئەو کەسەی کاروباری دینەکەی نەزانێت شەرعزان نییەو لە ڕیزی فەقێشدا نییە، بۆیە دەشێت دەرحەق بوترێت: ئەمە خێری بۆ نەخوازراوە، (چاکەی بۆ نەویستراوە). ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پلە بەرزیی شەرعناسان بەسەر

---

[1] مەبەستی ئەبو یەعلا رحمه الله ئەوەیە کە ئەگەر فەرموودەکەش سەحیح نەبێت ماناکەی ڕاستەو وایە.

پلەی ئاسایی خەڵکی تردا. هەروەها ئاستی ڕێزو گەورەیی شارەزابوونی شەرعە بەسەر شارەزاییبوون لە زانستەکانی تردا.[1] ئەبودەردا خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێ: (يَرزقُ اللهُ العلمَ السعداءَ ويُحْرَمُهُ الأشقياء)[2] واتە: خوای گەورە ئەم زانستە بە بەختەوەران دەبەخشێت خراپەکارو نەگبەتەکانی لێ مەحروم دەکات.

ب- زانست هەر بە فێربوون وەرناگیرێت: واتە: (بە سۆراخکردن و وەرگرتن)، بەڵکو دەبێت لوتفی خوای میهرەبانیشی وەلدا بێت، چونکە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێ: (مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ) هەر کەسێك خوای گەورە بخوازێت تووشی خێرو چاکەی بکات لە دینەکە شارەزای دەکات. نەیفەرموو (لیتفقه) واتە: شارەزا دەبێت، شارەزا کردنەکە ڕەنجی خۆی نییە، بەڵکو لوتف و ڕێزی خوایە، وەکو (هیدایەتدان) بەڵام ڕەنجی موسوڵمانەکەو هەوڵی فێربوونەکەی هۆکاری شارەزایەتیەکەیەتی. لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێ: (وإنَّمَا أنَا قاسِمٌ واللهُ يُعطي) واتە: من هەر بە شکارو گەێنەرەوەم، خوا خۆی دەیدات. کەواتە زانستە شەرعییەکەش پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گەێنەرەکەیەتی، ئەو شارەزایە کە دەبەخشێت و فێردەکات، بەڵام هەر خوای گەورە دابەشی دەکات. ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەرکەسێك پشکێکی لەو زانیارییەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەرکەوت ئیتر بووبێت بە شەرعناسی شارەزاو پسپۆڕ.

---

[1] فتح الباري (١\١٦٥).

[2] ابن عبدالبر: جانب بيان العلم (١\٥٧).

ئەو ئایەتەش پاڵپشتی ئەمەیە کە دەفەرموێ: (يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا) البقرة/٢٦٩ واتە: خوای گەورە دانایی دەبەخشێتە هەرکەسێك کە خۆی حەز بکات بیداتێ. هەر کەسێکیش دانایی بدرێتێ، ئەوە بە تەئکید خێری زۆری خراوەتە ڕێ. کەوا بوو داناییەکەش هەر خوابەخشە (وەکو هیدایەت و زانستەکە). دانایی - کە بریتیە لە ڕەفتاری گونجاو لە کات و شوێن و بە ڕادەی شیاوو گونجاو - هەر دەچێتەوە سەر ڕەفتارکردن بە پێی شەرع، بۆیە (ئیبنوعەبدوالبەڕ) لە ئیمامی مالیکەوە دەگەڕێتەوە کە فەرموویەتی: (الحِكمَة هي الفقهُ في دينِ لله)[1] واتە دانایی شارەزابوونە لە دینەکەی خوای گەورە.

- هەر ئیبنوعەبدولبەڕ لە ئیمامی مالیکەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: (الْحِكْمَةُ وَالْعِلْمُ نُورٌ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَلَيْسَ بِكَثْرَةِ الْمَسَائِلِ) واتە: دانایی و زانست (مەبەست زانستی شەرع و شارەزایی بوونە تێیدا) نووری ڕێزەو خوای گەورە دەیکاتە مایەی ڕێنیشاندانی خواوویستی بۆ هەر کەسێك کە خوای گەورە خۆی بیەوێت، ئەمە بە بەرفراوانی و پەلوپۆ لێبوونەوەی زانستەکە نییە.. هەروەها فەرموویەتی: (الْعِلْمُ لَيْسَ بِكَثْرَةِ الرِّوَايَةِ، هو نُورٌ يَجْعَلُهُ اللهُ حَيْثُ يَشَاءُ،)[2] واتە: زانست بە زۆر گێڕانەوەی فەرموودە نییە، بەڵکو نورێکەو خوای گەورە دەیخاتە دڵەکانەوە.

---

[1] إبن البر : جامع بيان العلم (١\١٧) .

[2] **جامع بيان العلم (٢/٢٥).**

ج- فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بە کەسێك ناوترێت شەرعناس و شارەزای دین، هەتا کار بە زانینەکەی نەکات، ئەو کەسە زاناو پیاوچاکەو دروستە پێی بووترێت شەرعناس و زانا کە بە نییەتی پاکەوە رێی وەرگرتنی زانستی گرتۆتە بەرو خوای گەورەش تووشی خێر و چاکەکاری کردووەو کارەکەی بۆ ئاسان کردووە، ئەمە ئەو فەرموودەی: (مَن يُرِدِ اللّٰهُ بِهِ خيراً)ی بەسەردا چەسپیووە. ئەمما ئەو کەسەی هەر زانیاری کۆکردۆتەوەو کاری بە عیلمەکەی نەکردووە، ئەوە داماوە، زەمکراوو هەڕەشە لێکراوە. خوای گەورە بە هەڕەشەوە دەفەرموێ: (أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ) البقرة/٤٤ واتە: چما ئێوە فەرمان بە خەڵك دەکەن چاکە بکەن، کەچی خۆتان لەبیر دەچێتەوە؟.. ئەمە گەورەترین شتێکە کە ڕقی خوای گەورە هەڵدەستێنێت. وەکو دەفەرموێ: (كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ) الصف/٣ واتە: گەورەترین شتێك کە ڕقی خوای گەورە هەڵدەستێنێت ئەوەیە کە شتێك بڵێن و خۆتان کاری پێنەکەن.. (مقت) مایەی تووڕە بوون و ڕق هەستان و سزایە، چۆن لەگەڵ (يُرِدِ اللّٰهُ بِهِ خيراً) دا لە کەسێکدا کۆدەبێتەوە؟ حەتمەن کۆنابنەوە؟ بۆیە دەشێت کابرا دەیان لق و پۆپی زانستێك بزانێت، بەڵام -بە پێناسەی شەرع - نەچووبێتە ڕیزی شارەزایانەوە. چونکە شارەزابوون لە دینەکە پێوەپابەندبوون و چەسپاندن (تەتبیق کردن)ی لەگەڵدایە، نەك هەر ووتنەوەی.. کەواتە زانابوونی کەسێك - کە خێرێکە خوای گەورە تووشی خاوەنەکەی دەکات - ئەو کاتەیە کە زانینەکەی چۆتە بواری

کردەوەوە، نەك هەر پسپۆڕی و لێزانیی.. دەبێ بە زانین و کردەوە (يفقهه في الدين)ە کە هاتبێتەدیی.[1]

د - فەرموودەکە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە زانا و شەرعناس و شارەزایانی دین لەم ئوممەتە نابڕێن و لە هەموو کات و شوێنێکد هەر دەبن، تا ئەو کاتەی فەرمانی خوای گەورە کۆتایی بە ژیان دێنێت. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - لە فەرموودەی تردا - ئاماژەی بەمە کردووە. دەفەرموێ: (وَلَنْ تَزَالَ هَذِهِ الْأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللَّهِ)[2] بوخاری واتە: ئەم ئوممەتە بەردەوام دەبێت لە پابەندی و پیادەکردنی دینەکەی خوادا.. پیادەکردنی دینەکەش بە شارەزایی و پابەندبوون دەبێت بەو حەقەوە کە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت. وویستی خوای گەورە وای خواستووە تا خەڵکی بیانوی نەزانینیان نەمێنێت. ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێك شارەزایانی دینەکە لە ناو خەڵکیدا هەبن، کە پیاوچاك و ئامۆژگارو ڕێنیشاندەری خێرخوازییان بن.. لەم ڕوانگەیەوە کە سەیدنا (علی کوڕی ئەبوتالب) ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت: (لَنْ تَخْلُوَ الأرضُ مِنْ قائِمٍ للهِ بِحُجَّةٍ)[3] واتە سەرزەوی خاڵی نابێت لە بەهانەبڕی خوای گەورە. واتە

[1] إبن القيم: مفتاح دارالسعادة (١/٦٠).

[2] . البخاري (٧١).

[3] الفقيه المتفقه: (١/٥٠) إعلام الموقعين: (٤/١٥٠).

ئەو کەسانەی کە دینەکە ڕوون دەکەنەوە و ئیقامەی حوججە دەکەن تا بیانووی خەڵکەکە ببڕن.

هەندێك لە زانایان و شەرعناسان ئەم فەرموودەیان کردووە بە بەڵگەی هەبوونی موجتەهید لە هەموو زەمانێکداو دەفەرموون ئیجتیهادی زانایان تا ڕۆژی دوایی بەردەوام دەبێت.[1]

لە ڕیوایەتی بوخارییدا کە دەفەرموێ: ئەم حاڵەتەی هەبوونی زانست و زانای پیاوچاك و شارەزایانی دین بەردەوام دەبێت (حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرِ اللَّهِ) تا فەرمانی خوای گەورە دێت. مەبەست لەو (با) یەیە کە لە کۆتا ڕۆژی دونیادا بەسەر خەڵکیدا دێت و هەرچی مسوڵمانە پێی دەمرێت و خراپەکارەکان دەمێننەوە کە قیامەت لەسەر ئەوان دادەمەزرێت. وەکو لە ڕیوایەتی موسلیمدا هاتووە:

موسلیم لە (عبدرالرحمانی کوڕی شوماسەی مەهرییەوە) ڕیوایەتی کردووە کە فەرموویەتی، لە خزمەتی مەسلەمەی کوڕی موخەللەد دا بووم کە عبداللە کوڕی عەمری کوڕی عاصی لابوو، عبداللە فەرمووی: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ هُمْ شَرٌّ مِنْ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ لَا يَدْعُونَ اللَّهَ بِشَيْءٍ إِلَّا رَدَّهُ عَلَيْهِمْ) واتە: قیامەت بەسەر خراپترینی خەڵکیدا دێت، ئەوانە لە ئەهلی جاهیلیەتی پێش ئیسلام شەڕخوازترن، بۆیە هەر دوعایەك بکەن خوای گەورە بە ڕوویاندا دەداتەوەو قبوڵی ناکات لێیان.. ئەمان لەو حاڵەتەی کۆڕەکەیاندا بوون کە (عوقبەی کوڕی

---

[1] فتح الباري: (١/١٦٤).

عامر) هاتە لایان، مەسلەمە پێی فەرموو: وەرە گوێبگرە عبداللە چی دەفەرموێت؟ عوقبە فەرمووی: عبداللە شارەزاترە. بەڵام من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەیفەرموو: (لَا تَزَالُ عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى أَمْرِ اللَّهِ قَاهِرِينَ لِعَدُوِّهِمْ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ)[1] واتە: کۆمەڵە مسوڵمانێکی ئوممەتەکەم لەسەر ئەم دینە بەردەوام دەبن بە جیهادکردن لە پێناو خوادا، بە کوشتار شکست بە دووژمنانیان دەهێنن، ئەوانەی پشتیان بەردەدەن و لەسەریان ناکەنەوە زەرەر لەوان نادەن، هەروەها ئەو کەسانەی پێچەوانەکاریانن کاریگەری خراپیان لەسەریان نابێت، ئەم حاڵەتەش هەروا تا قیامەت دەڕوات و هەموو ئەوانەش لەسەر ئەم هەڵوێستانەیان بەردەوام دەبن! ئینجا عبداللە فەرمووی: بەڵێ وایە. پاشان خوای گەورە (با) یەك هەڵدەكات كە وەكو بۆنی (مسك) بڵاودەبێتەوەو وەكو ئاوریشم بە نەرموونیانی بەر كەسەكان دەكەوێت، هەر كەسێك مسقاڵێك، بە قەدەر دەنكە دانەوێڵەیەك باوەڕی لە دڵدا بێت ئەو (با) خۆشە گیانی دەكێشێت و دەمرێت. ئاوا هەموو مسوڵمانەكان دەمرن و هەر خراپەكارو شەڕخوازەكان دەمێننەوە، قیامەتیش لەسەر ئا ئەوانە دادەمەزرێت ..

هەموو بەڵگەكان بەردەوام بوونی زانست و هەبوونی زانا و شەرعناسی پیاوچاك دەگەیەنن، كە . تا رۆژی قیامەت دادێت . لەم ئوممەتەدا دەبن...

---

[1] مسلم (٣٥٥٧).

زۆر ڕیوایەتی فەرمووده کە باسی دەستەی سەرفراز (الطائفة المنصورة) دەکەن، ئەوە دەسەلمێنن کە پابەندیی ئەم ئوممەتەو مانەوەی لەسەر حەق و ڕاگەیاندنی حەقەکە بەرپرسێتی دوو کۆمەڵە مسوڵمانن:

یەکەمیان: ئەهلی عیلم کە زانایان و شەرعناسی پیاوچاك و حەقبێژن.

دووەمیان: ئەهلی جیهادن. کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەربارەیان فەرموویەتی: (لَا تَزَالُ عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى أَمْرِ اللَّهِ قَاهِرِينَ لِعَدُوِّهِمْ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ) واتە: کۆمەڵە مسوڵمانێك لەسەر حەق دەمێننەوە و جیهادی لە پێناودا دەکەن و سەردەکەون بەسەر هەرکەسێکدا کە دژایەتیان دەکات، بەردەوامیش دەبن تا ڕۆژی قیامەت دادێت ..

ئەم دوو کۆمەڵە مسوڵمانەی کە ئەرکی سەرەکی دینەکەیان لەسەرە: شەرعناسان و موجاهیدەکانن، کە خاوەن پەیام (کتێبەکەی خوا) و خاوەن هێزی ئاسنەکەن، کە خوای گەورە پێکەوە لە سوورەتی (الحدید) دا دەربارەیان دەفەرموێ: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ) الحدید/٢٥ واتە بە تەئكید نێردراوەکانی خۆمان بە بەڵگەو نیشانەی ڕۆشنەوە نارد، پەیام (کتێب)یشمان لەگەڵدا ڕەوانە کردن، هەروەها تەرازو، تا خەڵکەکە دادپەروەرانە لە ناو خۆیاندا دادپەروەریی پیادە بکەن، ئاسنیشمان بۆیان ناردە خوارەوە کە مایەی هێزو توانایەو سوودی زۆری بۆ خەڵکی تێدایە. ئەوە مەبەستەکە خوای گەورە بزانێت کە: کێ دینی خواو ڕێبازی

پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەردەخات. خوای گەورە بەهێز و دەسەڵاتدارە.

ئەمە هەر ئەوەیە کە ئیبنوتەیمیە رحمە اللە تەئکیدی لێدەکاتەوە، کە زەروورەتی هەبوونی هەردوو کۆمەڵەکە (زانایان و موجاهیدان )نە.[1] خەتیبی بەغدادیش بە سەنەدەوە لە (ئیسحاقی کوڕی عبداللە)وە هێناوێتیەوە. فەرموویەتی: (نزیکترین کەس لە پلەی پێغەمبەرایەتیەوە ئەهلی زانستی شەرعیی و ئەهلی جیهادن، ئەما ئەهلی زانستی شەرعیی ئەوە ڕێگاکەی پێغەمبەران بەردەوام دەناسێنن و ئەهلی جیهادیش بەرگری لەو پەیامە دەکەن کە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت هێناویانە).[2]

٣- لە گەورەیی زانستی شەرعیی و ڕێزی فێرخوازانێتی کە فەقێ وەکو موجاهیدی ڕێی خوای گەورەیە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: (مَنْ جَاءَ مَسْجِدِي هَذَا لَمْ يَأْتِهِ إِلا لِخَيْرٍ يَتَعَلَّمُهُ أَوْ يُعَلِّمُهُ، فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَمَنْ جَاءَ لِغَيْرِ ذَلِكَ فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ الَّذِي يَنْظُرُ إِلَى مَتَاعِ غَيْرِهِ)[3] واتە: هەر

---

[1] مجموع الفتاوى:(١٠/ ٣٥٤).

[2] الفقيه المتفقه: (٣٥/١).

[3] مسند أبى يعلى الموصلى (٦٤٣٥)، ئیمامی ئەحمەد (٢٥٧/١٤ ) ئیبنوماجە (ژ٢٢٧) دەشفەرمووێ: إسناده حسن، ئیبنوحببانیش بە سەحیحی ناساندووە. هەروەها ئەلبانی لە (صحیح الترغيب/٨٧) دا..

کەسێك بێتە ئەم مزگەوتەی من، بۆ خێر و چاکەیەك بێت تا فێر ببێت. یان فێر بکات، ئەوە لە ڕیزی (موجاهید فی سبیل اللّٰه) دایە. هەر کەسێکیش بۆ غەیری ئەوە بێت وەکو کابرایەك وایە کە دانیشتووەو چاوی بڕیووەتە کەل و پەلی خەڵکی تر!

- ئیبنوعبدولبەر لە ئەبوددەردائەوە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: (من رأى الغُدُوّ والرَّواحَ إلى العلم ليسَ بجهادٍ، فقدْ نَقصَ عَقْلُهُ ورَأيهُ) واتە: هەرکەسێك چوون و هاتنەوەی بۆ وەرگرتنی زانستی شەرعیی بە جیهاد نەزانێت، ئەوە ژیریی و هزرو بۆچوونی نوقسانە.. هەروەها لێوەی گێڕاوەتەوە: (ما مِنْ أَحَدٍ يَغْدُو إِلَى المَسْجِدِ لِخَيرٍ يَتَعَلَّمُهُ أو يُعَلمّهُ إلا كُتِبَ لهُ أجرُ مُجاهَدٍ لايَنْقَلِبُ إلا غانِمَاً)[1] واتە: هەرکەسێك بچێت بۆ مزگەوت، بۆ فێربوون یان فێرکردن، حەتمەن پاداشتی موجاهیدێکی وای بۆ دەنوسرێت کە بە دەسکەوتەوە نەبێت ناگەڕێتەوە.

- ئیبنولقەیم رحمەاللّٰه دەفەرموێ: (لایەنی پەنجایەم - لە گەورەیی زانست -دا: ئەو فەرموودەیەیە کە ترمزی هێناویتیەوە کە ئەبوجەعفەری ڕازی لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە گێراوێتیەوە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: (مَنْ خَرَجَ فِي طَلَبِ الْعِلْمِ فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى يَرْجِع)[2] واتە: هەر کەسێك لە ماڵ دەرچێت و بە دوای زانستدا بگەڕێت تا دێتەوە ماڵ بە

---

[1] **جامع بيان العلم (١\٣١-٣٢).**

[2] **نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی دەربارە نوسیووە: (قال الترمذي هذا حديث حسن غريب رواه بعضهم فلم يرفعه) ئەلبانی رحمه الله لە المشكاة (٢٢٠)، السلسلة الضعيفة (٢٠٣٧)، ضعيف الجامع الصغير(٥٥٧٠) )دا دەفەرموێ: زەعیفە**

(جیهادکردن لە پێناوی خوادا) بۆی حسێبە. بۆیە پلەی زانست و فێرخوازانی زانست گەیشتۆتە ئەو ئاستە مەزن و کاریگەرە، چونکە مانەوەی ئیسلامەکە بە زانستەکەوەیە، هەر وەکو کە بە جیهادەکەشەوەیە، ئەوەی دین دەهێڵێتەوەو ڕای دەگرێت و دەیپارێزێت زانست و جیهادە. بۆیە جیهادەکەش دوو مەیدانی دەرەوەیە: بە دەست و بە زمان. بەشداران لە جیهادی دەستدا زۆرترن لە موجاهیدانی زمان، کە دەکاتە ڕوون کردنەوەی بەڵگە و سەلماندنی حەق و ڕەوایی دینەکە. ئەم جیهادەیان تایبەتە. لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەراندا هەر زانایان و شارەزایانی دینەکە دەتوانن مومارەسەی بکەن. پێشەوایانی شەرع فەرماندەی ئەم جیهادەن. ئەمیشیان گەورەترو مەزنترە وەك لە جیهادی دەست. چونکە ئەم جیهادەیان سوودی زۆرترو قورسای زۆرترو دووژمنی زۆرتری هەیە.. خوای گەورە لە سوورەتی (فورقان)دا کە مەککیە دەفەرموێت: (وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيرًا * فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا) ئەگەر بمان ویستایە هۆشدەرێکمان لە هەموو ناوچەیەکدا دادەنا، تۆ گوێڕایەڵی کافران مەکە و بەم قورئانە جیهادێکی گەورەیان لە دژ بەرپا بکە.. ئەم جیهادەیان بە قورئانەکەیە، بە موعجیزەی قورئان و سوننەتەکانێتی.. ئەم جیهادە گەورەترە، چونکە جیهادە دژی دووڕووەکانیش. خۆ دووڕووەکان لە جیهادی دەستدا دژی مسوڵمانان نەدەچوونە بەرەی شەڕ. بەرەیەکی چەکداری سەر بەخۆی خۆیان نەبوو، بە جەستەو سەرزارەکی و ڕەفتار نواندن هەر لەگەڵ موسوڵماناندا بوون و لە ڕیزیاندا دەجەنگان! زاهیرەن دژی دووژمنانی ئیسلام دەوەستانەوە! لەگەڵ ئەمەشدا خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمویٚ: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ) التوبة/٧٣ واتە: ئەی

پێغەمبەر، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دژی کافرو دووڕووەکان جیهاد ڕاگەیەنەو توندوتیژ بە لە سەریان ..

خۆ جیهاد دژی دووڕوو بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە دەبێت. بە بانگهێشت کردنی خەڵکی دەبێت بۆ دین و دینداریی. کەوابوو (سبيل الله) کە لە پێناوی خوادایە بریتیە لە جیهادو وەرگرتنی زانستی شەرع و بانگهێشتکردنی خەڵکی بۆ خواوویستی). [1]

٤- بەڵگەیەکی تر لەسەر گەورەیی زانستی شەرعیی و ڕێزو قەدری فێرخوازانی، ئەو فەرموودە بەناوبانگەی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە دەفەرمویێ: (مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَبْتَغِي فِيهِ عِلْمًا سَلَكَ اللَّهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضَاءً لِطَالِبِ الْعِلْمِ، وَإِنَّ الْعَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ حَتَّى الْحِيتَانُ فِي الْمَاءِ، وَفَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ، إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، إِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا إِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَذَ بِهِ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ)[2] واتە: هەرکەسێ ڕێگایەك بگرێتەبەر کە بە زانستی بگەیەنێت، خوای گەورە ڕێگایەکی بەرەو بەهەشت پێ دەگرێتەبەر، فریشتەکان (بۆ ڕێز لێگرتنیی)باڵیان ڕادەخەن بۆی، چونکە پێی ڕازین و قوتابی شەرع (فەقێ) یان خۆش دەوێت، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە داوای لێخۆش بوون لە خوای گەورە بۆ زانا دەکەن، تەنانەت ماسی دەریاش. پلەی زانا بەرامبەر پلەی خواپەرست (عابد) وەکو پلەی مانگی چواردەیە بەسەر ئەستێرە خامۆشەکاندا، زانایان

---

[1] ابن القيم: مفتاح دار السعادة (٧٠/١)

[2] ئەبو داود و ترمزی و ئیبنو ماجە لە ئەبو دەردائەوە وە ئیبنو حەببان بە سەحیحیان ناساندووە و موسلیمیش لە ئەبو هورەیرەوە بە مەرفوعی ئەوەندەی هێناوەتەوە: ( من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهل الله له طريقاً إلى الجنة) .

میراتگرانی پێغەمبەرانن، پێغەمبەران دینارو درهەمیان لە دوای خۆیان بەجێ نەهێشتووە، زانستیان بە میرات لەبەر ماوەتەوە، هەركەسێك بەشێك لەو میراتە بگرێت، ئەوە پشكی زۆری بەركەوتووە.

لە زۆر لایەنەوە ئەم فەرموودەیە تەئكید لە گەورەیی زانست و فەزڵی زانستخوازان دەكاتەوە، لەوانە:

أ- زانستی شەرعیی میراتی پێغەمبەرانە. علیهم السلام.

ب- زانایانی شەرع میراتگرانی پێغەمبەرانن، لە وەرگرتن و گەیاندنەوەی زانستەكانی شەرع و حوكم و داوەریی پێكردن، نەك لە یاسا و ڕێسا دارِشتندا.

ت- هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدان داوای لێخۆشبوون بۆ ئەهلی زانستی شەرعیی دەكەن.

ث- ڕێی وەرگرتنی زانستی ڕێگای بەرەو بەهەشت چوونە.

جا چ پلەیەك لە سەروو ئەمەوەیە؟!

٥- زانستی شەرعیی سەرۆكایەتی حەقیقیە: چونكە زانایانی شەرع مەرجەعییەتی خەڵكن و یەكلاكردنەوەی ناكۆكی و كێشەی خەڵكی دێتە بەردەستی ئەوان، ئەوەی ئەوان بڕیاری لەسەر دەدەن لەسەر دڵ و چاو دادەنرێت و ڕادەپەڕێنرێت.. پێشتر باسمان لەمە كرد، خوای گەورە لە باسی چارەسەری ناكۆكی مسوڵماناندا دەفەرمویَ بگەڕێنەوە لای خواو پێغەمبەرەكەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كە گەڕانەوە بۆ ئەحكامەكانی قورئان و سوننەت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا) النساء /٥٩ گەڕانەوە سەر قورئان و سووننەتیش

گەڕانەوەیە بۆ لای زانایان و شەرعناسان، کە زانستە شەرعییەکەیان لەلایە: (وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ) النساء/٨٣ ئەگەر کێشە و ناکۆکی و قسە و باس و ئیدیعایەکانی ناحەزانی خۆیان بهێنایاتەوە لای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و لای سەرپەرشتیارانی خۆیان، ئەوان دەیانزانی چ ئەحکامێکی شەرع دەیگرێتەوەو دەبێ هەڵوێستی چۆن بەرامبەری بگیرێتەبەر.. کەوابوو شەرعناسان حاکمی کردەوەیی ناو موسوڵمانانن، چونکە ئەوانن کە دەفەرموون: ئەوە جائیزە دەشێت، ئەوەیان جائیز نییە، ناشێت، ئەوەیان ڕاستەو ئەویان چەوت و هەڵەیە، دەبێ بە قسەیان بکرێت. شاطبی دەفەرموێ: (بۆیە زانایان لە داوەریکردن و فەتوابۆدان و ڕێنیشاندان بوون بە حاکمی خەڵکی، چونکە ئەوان زانستە شەرعییەکەیان لایە، بە شێوەیەکی گشتی بێباکانە بوونەتە فەرمانڕەوای حەقیقی).[1]

. هەندێك لەو فەرموودانەی ئەمە دەسەلمێنن: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنْ الْعِبَادِ وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا)[2] واتە: خوای گەورە زانستیە شەرعییەکە ناباتەوە بۆ لای خۆی و لە ناوتاندا نەیهێڵێت، لە خەڵکەکەی دانامالێت، بەڵکو بەوە لە ناویاندا نایهێڵێت، کە زاناکان دەمرێنێت، ئیتر کە زانا نەمایەوە، خەڵکەکە سەرانی نەزان دەکەنە پێشڕەوان و ئاڕاستەوانانی خۆیان، ئەمان شتیان لێدەپرسن و ئەوانیش بە نەزانی فەتوایان بۆ دەدەن، هەم خۆیان گومڕا دەبن هەم خەڵکەکەش گومڕا دەکەن..

---

[1] الشاطبي : الإعتصام (٢\٣٤١).

[2] متفق عليه

فەرموودەکە ڕاشکاوانە هاندەدات کە کەسانی شەرعناس و شارەزای دین بخرێنە پێش و بە ئاڕاستەوان دابنرێن، نەك نەزان و هێڕ!

. ئیمامی موسلیم لە نافیعی کوڕی عبداللهی خوزاعییەوە هیناوێتیەوە کە لە مەککە والی سەیدنا عومەر بوو خوا لێیان ڕازی بێت، نافیع لە ناوچەی (عوسفان) بە خزمەت سەیدنا عومەری خەلیفە دەگات، خەلیفە لێی دەپرسێت کێت لە شوێن خۆت بەسەر خەڵکەکەوە داناوە؟ نافیع فەرمووی: ئیبنوئەبزام داناوە. عومەر فەرمووی: مەوالیت بەسەرەوە داناون؟ نافیع فەرمووی: ئاخر ئەو قورئانەوانە (قارئ لکتاب الله) و زانای میراتە.. سەیدنا عومەر فەرمووی: پێغەمبەرەکەت صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەیفەرموو: (إنّ اللهَ يَرْفَعُ بهذَا الكِتابِ أقْواماً وَيَضَعُ بهِ آخَرين) واتە: خوای گەورە بەم قورئانە کەسانێك بەرز دەکاتەوەو کەسانێکی تری پێ نزم دەکاتەوە.. کەوابوو ئیبنوئەبزا کە خاوەن زانستی شەرعیی بوو شایانترین بوو لە جێی والی دانیشێت و ئیدارەی مەککەو کۆمەڵگەکەی ببات بەڕێوە.

. هەروەها قورئانی پیرۆز - لە سەرۆکایەتی و فەرمانڕەوایەتی خەڵکیدا- ئاماژە بە مەرجی زانستێتی دەکات. دەفەرموێ (وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوا أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) البقرة/ ٢٤٧ واتە: بەنو ئیسرائیلیەکان کە پێغەمبەرەکەیان سەلامی خوای مێ بێ پێی فەرموون کە خوای گەورە طالووتی کردۆتە فەرماندەتان، هاواریان لێهەستا کە چۆن دەبێت ئەو ببێتە فەرماندەمان، کە ئێمە شایانترین ببین؟! (چونکە لە بەرەبابێکی تر بوون)، سامانیشی زۆر نییە؟ پێغەمبەرەکەیان پێی فەرموون: ئاخر ئەو خوای گەورە

بۆ ئەو پلەیە هەڵیبژاردووە، چونکە زانست و هێزێکی جەستەیی تەواوی پێداوە. خوای گەورەش موڵکی خۆی دەبەخشێت بە هەر کەسێك کە خۆی دەیەوێت، خوای گەورە خاوەن موڵکی بەرفراوان و ئاگاداریی و زانینی تەواوە.

٦- زانایان ئەمینداری ئەم دینەن: نەزانان فێردەکەن، توندڕەوو تیژتێپەڕان دەگرنەوە، گومانی دوو دڵ و دەغەڵان دەرەوێننەوەو بیدعەی بیدعەچییان ڕاست دەکەنەوە.. وەکو فەرموودەکە دەفەرموێت: (يَحْمِلُ هَذَا الْعِلْمَ مِنْ كُلِّ خَلَفٍ عُدُولُهُ، يَنْفُونَ عَنْهُ تَحْرِيفَ الْغَالِينَ، وَانْتِحَالَ الْمُبْطِلِينَ، وَتَأْوِيلَ الْجَاهِلِينَ)[1] واتە: ئەوەی ئەم زانستە هەڵدەگرێت جێمتمانەی نەوەکانن، لادەرێتی توندڕەوان و دەلەسەی ناڕەوایان و لێکدانەوەی نەفامانی لێ دوور دەخەنەوە.. ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل رحمه الله لەم فەرموودەیەوە پێشەکی کتێبەکەی (الرد على الزنادقه والجهميه) دارشتووە کە تێیدا دەفەرموێت: (سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە هەموو قۆناغێکی ژیانی خەڵکییدا پێغەمبەرانی عليهم الصلاه و والسلام ناردووە..

خوای گەورە زانایانی هیدایەت داوەو تێیگەیاندوون تا هەر کەسێك گومڕا ببێت، ئەمان بیگێڕنەوە سەر هیدایەتی خوایی، زانایانیش ئەوانەی کە لەسەر ئازار و ناڕەحەتییەکانی ڕێ، خۆدەگرن و بەئارامن و ئەو ئەحکامە مردووانەی پەیامی خوایی زیندوو دەکەنەوەو بە نووری خوایی بەرچاوی کوێرەکان ڕۆشن

---

[1] ئیبنو عەدی لە سەیدنا علی و عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت گێڕاویتیەوە، هەروەها خەتیبی بەغدادیش لە موعازەوە، تەبەریی لە ئوسامەی کوری زەیدەوە، هەروەها لە ئەبو هورەیرەو ئیبنومەسعودەوە هاتووە، ئیمام ئەحمەد دەفەرمووێت: فەرموودەیەکی صەحیحە. (خەللال لە کتێبی (العلل)ە وە لێوەی گێڕاویتیەوە، وەکو ئیبنولقەییم لە کتێبی ( مفتاح دارسعادة ١\١٣٦) وخەتیبی بەغدادیی لە ئیمام ئەحمەدەوە هێناویتیەوە. بڕوانە: کتێبی (شَرَفُ أصحاب الحديث ل٢٩).

دەکەنەوە.. ئای ئەم جۆرە زانایانە چەند کوژراوی دەستی ئیبلیسیان زیندوو کردۆتەوە؟! چەند گومڕای سەرگەردانیان هێناوەتەوە سەر ڕێ؟! ئای ئاسەوارو کاریگەریان چەند بەسەر خەڵکییەوە دیارە؟! ئای چەند ئاسەوار و کاریگەری خراپی خەڵکیش وابەسەر ئەوانەوە؟! ئەوان قورئانەکە دەپارێزن، ڕای ناموٚو پەڕیدەی لێ دووردەخەنەوە، دەلەسەی نارەوایانی لێ لا دەدەن، لەو لێکدانەوەو تەئویلاتەی نەزانان دەیپارێزن، داهێنانی بیدعەچییانی لێ بژار دەکەن، کە بەیداخی بیدعەیان لێ بەرزکردۆتەوەو جڵەوی ئاژاوەو گومانباریان شل کردووە.. ئەمانە کە خۆیان لە تێگەیشتنی پەیامی خوادا هەڵە حاڵیین، ڕاجوێ و ناکۆکن، پێچەوانەی ڕێسای تێگەیشتنن، بۆچوونیان تەنها لەسەر شتێك کۆیە، کە پێچەوانەی ئاڕاستەی قورئان بوەستێتەوە! بە ناوی خواوە دەدوێن و فەرمایشتی ئەو تەفسیر دەکەن، بێ ئەوەی زانستێکیان لەسەر هەبێت! لە دووی هەموو باسێکدا کە جەنگ و جیدالیان بەتینتر دەکات، خەڵکی نەزان فریوو دەدەن، چەواشەیان دەکەن، بەوەی بە ناوی ئیسلامەوە بۆیان باس دەکەن. خوایە پەنا بەتۆ لە فیتنەی گومڕاو سەرگەردانان)[١]

٧- لە فەزڵی زانستی شەرعیی ئەوەیە کە خاوەنەکەی دوای مردنی خۆشی پاداشتی بڵاوکردنەوەی زانست و گەیاندنی بانگەوازەکەی بەردەوام پێدەگات. هەر کەسێك زانستییەکی لێوەرگرتبێت و کاری پێکردبێت و بڵاوتری کردبێتەوە، هەمووی بۆ ئەم زەخیرەی پاشەکەوتە! لەوانەیە ئەم زانستێکی شەرح کردبێت

[١] **مجموعة عقائد سلف/دار المعرفة/ أسكندرية – مصر ١٩٧١(ل ٥٢) هەروەها : إبن تيمية: منهاج السنه توێژنەوەی د. محمد رشاد سالم (٢٧٣\٥) و إبن القيم : إعلام الموقعين ( ١\٩).**

و یەکێك لە وەرگرەکانی کردبێتی بە کتێب، ئیتر بێ ئەوەی ئاگادار بێت، سەرمایەیەکی وەبەرهێنانی مسۆگەرکردووە، بەڵگەی ئەمە زۆرە لەوانە:

أ- فەرمایشتی خوای گەورە: (إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ) یس/١٢ واتە: ئێمە خۆمان مردوو زیندوو دەکەینەوەو هەرچییەکیان کردووە خۆیان و ئاسەوارو شوێنەواریان دەنووسین، ئاماری هەر هەموو شتێکیانمان لە دیوان (کتێب)ێکی گەورەدا نوسیووە. (إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى) رۆژی قیامەت کە خەڵکەکە زیندوو دەکرێنەوە: (وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا) هەموو ئەو کارو کردەوانەیان دەنووسین کە لە دونیا کردوویانە، (وَآثَارَهُمْ): شوێنەوارەکانیشیان، ئەوانەی دوای مردنی خۆیان جێیان هێشتووەو بە خێر بۆیان گێڕاوەتەوە، یان بۆیان بۆتە خراپەو لەسەریان نوسراوە.. چاکەو خێرەکانیان بۆتە صەدەقەی جاریە. واتە خێری بەردەوام. چونکە زانستی بەسوود یەکێکە لەو سەرچاوە خێرانەی دەبنە خێری بەردەوام، مادام زانستییە کە دوای مردنی زاناکە هەر بەردەوام بڵاو دەکرێتەوەو کاری پێ دەکرێت. ئەوە وەکو جۆگەی ئاو بەردەوام دەڕوات، ووشکیش ناکات! بیدعەو گومڕایی و ڕێبازی چەوت و لاریش هەر وایە. وەکو لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە، ئەویش بڵێسەو دووکەڵی نەبڕاوەی بەردەوامە بۆ گیانی خاوەنەکەی.

ئیبنوکەثیر لێکدانەوەیەکی تری: (وَآثَارَهُمْ) دەهێنێتەوە کە بریتیە: لە شوێنەوارو جێیان لە چوونیان بەرەو خواپەرستی و چاکەکاریی، یان ئینحیراف و خراپەکاریی.. هەر چەندە ئەم لێکدانەوەیەش لە ڕووی فەرمانەوانییەوە ڕێی تێدەچێت، بەڵام بۆچوونی یەکەم بەهێزترە، چونکە (وَآثَارَهُمْ) لەبەرامبەر (مَا قَدَّمُوا) دا هاتووە. واتە: ئەوەی کە خۆیان کردوویانەو ئەوەش کە بە هۆی کاریگەریانەوە بۆتە ئاسەوارو شوێنەواری ئەوان. ئەمەش دوای مردنی خۆیانە والله أعلم.

ب- فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: (مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ) [١] واتە: هەرکەسێك ڕێنیشاندەرێتی کارێکی خێر بکات، ئەویش وەکو بکەرەکە پاداشتی بۆ دەنوسرێت.

ت- هەروەها کە دەفەرموێ: ( مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى، كَانَ لَهُ مِنْ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ، كَانَ عَلَيْهِ مِنْ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا)[٢] واتە: هەرکەسێك خەڵکی بۆ خواویستی و هیدایەتی خوایی بانگ بکات، بە قەدەر پاداشتی هەموو ئەو کەسانەی بۆ دەنوسرێت کە بە دەنگییەوە دێن، بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە. هەرکەسێکیش خەڵکی بۆ گومڕای و لادان لە ڕێی خوا بانگ بکات، گوناحی بەقەدەر گوناحی ئەو کەسانە دەبێت کە شوێن ئەو بانگەشەو ڕێبازە دەکەون، بێ ئەوەی لە گوناحی ئەوان کەم ببێتەوە.

ث - (إِذَا مَاتَ ابْنُ آدَمَ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلا مِنْ ثَلاثٍ: مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ)[٣] واتە: کاتێك کە کەسێك دەمرێت کارو کردەوەکانی دەپسێت، جگە لە سێ کار کە پاداشتی بەردەوامی دەگاتێ: ئەگەر خێرێکی بەردەوامی کردبێت، یان زانستێکی جێ هێشتبێت کە سوودێکی هەبێت، یان کوڕێکی چاك کە دوعای بۆ بکات.

ئیبنو ماجەش هەر لە ئەبو هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت بە (مەرفووع)ی گێڕاوێتیەوە (إِنَّ مِمَّا يَلْحَقُ الْمُؤْمِنَ مِنْ عَمَلِهِ وَحَسَنَاتِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ عِلْمًا عَلَّمَهُ

---

[١] موسلیم لە ئەبومەسعودی بەدرییەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاوێتیەوە.

[٢] موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاوێتیەوە.

[٣] مسلم (١٦٣٥)، ترمذي (١٣٧٦)، ابوداوود (٢٨٨٠)، نسائي (٣٦٥١)، دارمي (٥٥٩).

وَنَشَرَهُ، أَوْ وَلَدًا صَالِحًا تَرَكَهُ، أَوْ مُصْحَفًا وَرَّثَهُ، أَوْ مَسْجِدًا بَنَاهُ، أَوْ بَيْتًا لابْنِ السَّبِيلِ بَنَاهُ، أَوْ نَهْرًا أَكْرَاهُ، أَوْ صَدَقَةً أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِهِ فِي صِحَّتِهِ وَحَيَاتِهِ تَلْحَقُهُ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ) واتە: لەو کارو کردەوە چاکانەی کە موسوڵمان دوای مردنیشی هەر مایەی خێرو پاداشت دەبن بۆی: زانستیەکە کە خەڵکی لێ فێرکردبێت و بڵاوی کردبێتەوە، ئەولادی چاك، کە جێی هێشتبێت، قورئانێکی بە میرات لە دوا بە جێمابێ، یان مزگەوتێکی دروست کردبێت، یا شوێنێکی حەوانەوەی ڕێبوارانی دروست کردبێت، یا ڕوبارێکی هەڵکەندبێت، یا خێرو خێراتێکی لە سەردەمانی ژیان و ساغ و سەلامەتی خۆیدا بەخشی بێت، هەموو ئەوانە دوای مردنی پێی دەگەنەوە.. [1] بڕوانە ئەو پاداشتە زۆرو مسۆگەرو هەرزانە! بڕوانە گەنجینەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە پاداشتی کاری خێری تاکە تاکەی ئوممەتەکەی تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام بۆ دەچێت.. ئینجا یاوەران بەردەوام خێری ئەم نەوە بە نەوانەی ئوممەتیان بۆ دەچێت، چونکە ئەوان زانستیەکەی پێغەمبەری خوایان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گەیاندە نەوەکانی شوێن و کاتی تر.. دوای ئەوان: زانایانی ئیسلام، لە پێشەوایانی تابیعین و دوای ئەوان.. ئەمانە تا ڕۆژی قیامەت ڕووباری جاری خێرو چاکەیان بۆ دەچێت! بڕوانە ئەو شەرعناسانەی کتێبیان داناوە، کە لە دوای خۆیان بڵاو بۆتەوە.[2] بۆ نموونە هەرکەسێك صەحیحی بوخاری خوێندبێتەوە سوودی لێ وەرگرتبێت، یا سوودی لاوەکی لێوەر گرتبێت، ئیمامی بوخاریی وەکو ئەوانە پاداشتی دەست دەکەوێت، هەر یەکێك لە پیاوانی سەنەدی فەرموودەکان کە بوخاریی بۆ

---

[1] بێگومان لەم سەردەردەمەدا دەیان خێرخوازێتی تر هەیە وەکو نەخۆشخانە، خزمەتی پەککەوتوان، کردنەوەی تۆڕێکی ئەنتەرنێت، بڵاوکردنەوەی کتێبی ئیسلامی .

[2] بڕواناکەم هیچ کتێبێك وەکو کتێبی عەقیدەی تەحاوی و رياض الصالحين و أربعين نووی بڵاوبووبێتەوە..

نموونە ڕیوایەتیانی کۆکردۆتەوە، هەر یەکەیان وەکو بوخاریی خاوەن پاداشتی سوود وەرگرتنی نەوە بە نەوەی ئەم ئوممەتەن لەو کتێب و ڕیوایەتانە! جا کتێب و زانستی تر لەگەڵ ئەمەدا بەراورد بکەو بە دوایدا برۆ!!! ئەوی هەر لە ڕیزی ئەم خێرە جاریەو زانستە بەسوودەیە: وەقفکردنی کتێبی زانستی شەرعییە: قورئان، تەفسیر، فەرموودە، شەرعناسی.. بیر لەوە بکەرەوە: قورئانێکت هەدیە کردووە[1] و لە مزگەوتێك داتناوە، ڕۆژانە خەڵکی تێیدا دەیخوێنن، تۆ کتێبێکی فەرموودەوانیت بەخشیوە بە یەکێك، بە دەرس دەیخوێنێت و پاشان دەیڵێتەوە، چی خێرێکی بەردەوامت بۆ دێت؟!

ئەم قورئان وەقفکردنە لە مزگەوت خوێندنی قورئان نییە بۆ مردوو، کە ئایا پێی دەگات یان نا؟ ئەوە باسێکی ترە ئێمە مەبەستمان لە دانانی قورئانەکەیە لە مزگەوت کە هەر خوێندنێك تێیدا بە بەخشەرەکەی دەگاتەوەو دەبێتە خاوەن پاداشت..

مەسەلەی ئەوەی کە ئایا خوێندنی قورئان پاداشتەکەی بە مردوو دەگات یا نا؟ ئەوە ڕاجوێی زانایانی لەسەرە. شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمیە دەفەرموێ: (پێی دەگات).[2] هەروەها پەسەندکراوی ئیبنولقەیمیشە رحمه الله کە دەفەرموێ: (ئەمما قورئان خوێندن و بە دیاری ناردنی پاداشتەکەی بۆ ئەو مردووە - ئەگەر خۆبەخشانە، بێ ئەوەی پارەی لەسەر وەرگرتبێت- ئەوە پێی دەگات، هەر وەکو کە ڕۆژوو حەجی پێدەگات).[3]

---

[1] بۆ قورئان ناڵێین کڕین یان فرۆشتن.

[2] مجموع الفتاوی (٢٤/٣٠٠ و ٣٢١ و ٣٢٤ و ٣٦٦) و (ب ٣١/ ٤١).

[3] الروح (ل ١٩١) چاپی مكتبة المدني .

٨- خاڵێکی تر لە فەزڵ و چاکەی زانستی شەرعیی ئەوەیە: زانستی شەرعیی بە پشتیوانی خوا پارێزەری خاوەن و وویستانێتی لە خراپە و ئاژاوەو لارێبوون. تا زانستی شەرعیی کەم بێت نەزانی و لادان زۆرتر دەبێت. ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ وَيَثْبَتَ الْجَهْلُ، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا)[1] واتە: لە نیشانەکانی کۆتایی هاتنی زەمان ئەوەیە کە زانستی شەرعیی نامێنێت، نەزانی دەچەسپێت، شەراب دەخورێتەوەو زیناش بە ئاشکرا دەکرێت. هەر لە ئەنەسەوە گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ : أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنَى، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَذْهَبَ الرِّجَالُ، وَتَبْقَى النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمٌ وَاحِدٌ) واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە زانستی شەرعیی کەم دەبێت، نەزانین دەبێتە دیاردە، زینا دەردەکەوێت بە (ئاشکرا دەکرێت)، ژن زۆر دەبن و پیاو کەم دەبن، تەنانەت وای لێدێت پەنجا ژن یەك پیاویان دەبێت سەرپەرشتیاریان بکات!!

هەر بوخاریی لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: (يُقْبَضُ العِلْمُ، وَيَظْهَرُ الجَهْلُ وَالفِتَنُ، وَيَكْثُرُ الهَرْجِ، قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا الهَرْجُ؟ فَقَالَ: هَكَذَا بِيَدِهِ فَحَرَّفَهَا، كَأَنَّهُ يُرِيدُ القَتْلَ)[2] واتە: زانستی شەرعیی لە ناودا هەڵدەگیرێت، نەزانیی تەشەنە دەکات، ئاژاوەی بێدینی دەبێتە دیاردەو هەرەج زۆر دەبێت، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەرەج چییە؟ فەرمووی ئاوا بە دەستی، خواری کردەوە، واتە کوشتن.

---

[1] بوخاری (٨١)، مسلم (٢٦٧٣).

[2] بوخاری/ کتاب الفتن (ذ ٧٠٦٢ و ٧٠٦٦ و ٧١٢١).

ئیبنوحەجەری عەسقەلانی رحمه الله لە شەرحییدا دەفەرمویٚ: (ناوهیٚنانی ئەم پیٚنج ڕەفتارە بەتایبەتی، وا دیارە لەبەر ئەوە بیٚت کە نیشانەی لاسەنگ بوون و لەبەر یەك هەڵوەشانی کاروبارێك بیٚت، کە ژیانی دونیاو قیامەتی پیٚکەوە پارسەنگ ڕادەگریٚت، کە دینەکەیە. چونکە نەمانی زانستی شەرعیی هەڵە تیٚگەیشتن و لاسەنگ بوونی پابەندیٚتی دینداریٚتیەکەیە. پشیٚویی ژیرییە، کە شەراب نۆشیی ناهیٚڵیٚت خەڵکی پارسەنگ بمیٚنن، نەسەب (ڕەچەڵەك) تیٚکەڵ دەبیٚت، چونکە زیناکاریی هەموو نەسەبەکان تیٚکەڵ دەکات، زۆر بوونی ئاژاوەو پشیٚویی گیان و ماڵ دەخاتە مەترسییەوە.. (کرمانیی) دەفەرمویٚ: ئیٚ هیچ پیٚغەمبەریٚکی تریش دوای پیٚغەمبەری خۆمان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نایات سەلامی خوا لە هەموویان. کەوابوو تیٚکچوونی سیستمی ژیانەکە حەتمی دەبیٚت..

قورتوبیی لە (الملهم)دا دەفەرمویٚ: نیشانەیەکی ڕۆشنی پیٚغەمبەریٚتی لەم فەرموودەیەدا هەیە. کە هەواڵی هەندیٚك ڕووداوی داهاتوو دەدات، کە ڕوو دەدەن، ڕووشیان داوە بە تایبەتی لەم زەمانەدا)[1] سەرنج بدە قورتوبیی دەفەرمویٚ بە تایبەتی لەم زەمانەدا!! زەمانی ئەو! کە هەزارو سەد ساڵ لەمەوپیٚشە! لەویش سەیرتر بۆچوون و پیٚناسەی (بەیهەقیی)ە کە لە کتیٚبەکەی (دلائل النبوة) دا فەرموودەکەی لای ئەنەس دەهیٚنیٚتەوە: (مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ..) لە بەشی (باب ما جاء في إخباره صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بذهاب العلم وظهور الجهل) ی لەم زەمانی ئیٚمەداو لە زۆربەی

---

[1] فتح الباری (١\١٧٩)، (الملهم) کتیٚبیٚکی شەرحی فەرموودەکانی سەحیحی موسلیمە کە ئیمامی قورتوبی نوسیویەتی ناوی ( المفهم شرح صحيح مسلم )ە و چاپکراوە الحمد لله .

وولاتان، نەزانی باڵی بەسەر هەمووواندا کێشاوە. هەموو ئەوانەی تر کە باسی فەرموون بوونەتە دیاردە ![1]

## خاڵێکی جێ سەرنج:

کەمبوونەوەی زانستی شەرعیی بە نەمانی زانایان دەبێت، وەکو لە فەرموودەی (ولكنْ يَقْبِضُ العِلْمَ بِقَبْضِ العُلَماءِ..) دا هاتووە. ئیبنوحەجەر دەفەرموێت: (لە هەر شوێنێك کە زانایەك کۆچی دوایی دەکات و زانایەکی تر نایەتەوە شوێنی، حەتمەن زانستی شەرعیی لەو شوێنەدا کەم دەکات)[2] ئەبوسولەیمانی خەتتابی رحمه الله ئەو فەرموودەی نەمانی زانایانی لە کتێبی (العُزلة)دا دەهێنێتەوەو لە راڤەیدا دەفەرموێ: (پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەواڵی ئەوەی داوە کە کێشەی زانستی شەرعیی نەمانی زاناکانێتی، کە ئیتر نەزانەکان خۆیان لەو خەڵکە دەکەنە زاناو پێشەواو ئاراستەوان و بە ناوی دین و زانستی شەرعییەوە خۆ دەکەنە دەمڕاستیان. ئەم فەرموودەیە ئاگادارکردنەوەو هۆشدان و حەزەرپێدانی خەڵکییە کە نەکەن ئیقتیدا بە کەسانێك بکەن، کە ئەوە سیفەتیانە. لە پێناسەشیاندا فەرمووی: ئەوانە هەم خۆیان گومڕان و هەم گومڕاکەرن، پاشان خەتتابی بە سەنەدی نەپساوەوە ڕیوایەتەکەی ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت دەهێنێتەوە کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: (إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ)کە بوخاری گێڕاویتیەوە.پاشان خەتابی دەفەرموێ: مەبەستەکە ئەوەیە. والله أعلم کە نەزان بە ناوو سیمای زاناوە دێنە پێشەوەو خۆ لەو خەڵکە

[1] دلائل النبوة (٦\٥٤٣) دارالكتب العلمية ١٤٠٥ ك .

[2] فتح الباري (١٣\١٧) .

دەکەنە شەرعناس و پێشەوایەتییان دەکەن، پێش ئەوەی خۆیان زانستی شەرعییان وەرگرتبێت، پێش ئەوەی خۆیان لەو زانستییە پێقایم بووبن دەبنە موفتی خەڵکەکە).[١]

. بەڵام ئەوە مانای وانیە کە زانستی شەرعیی بە یەکجاری بزر دەبێت و نامێنێت، نا چونکە دەستەی سەرفراز (الطائفة المنصورة) کە پازدە فەرموودەی لەسەرەو یازدە یاوەر ڕیوایەتیان کردووە - تا ساتە وەختی گیانکێشانی دەستە جەمعی ئیمانداران، کە لە کۆتایی ڕۆژی دنیایاندا دەبێت- هەر دەمێنن ئەوکاتە کە (شنەبا)یەکی خۆش هەڵدەکات گیانی موسوڵمانەکان بە جارێك دەکێشێت و قیامەت لەسەر خراپەکارەکان دادەمەزرێت. ئەمەش دوای دەرکەوتنی نیشانە گەورەکانی تری ڕۆژی دواییە: دوای هاتنی دەجال (ساختەچی) و کوژرانی، دوای هاتنە خوارەوەی سەیدنا عیسا سەلامی خوای لێبێت و کۆچی دوایی کردنی، دوای هاتن و دەرکەوتنی یەئجووج و مەئجووج و نەمانیان، دوای هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوەو دوای دەرکەوتنی گیانلەبەرە سەیرەکە (الدَابَّە) کە لەگەڵ خەڵکی دەدوێت. ئیتر دوای ئەوانە دڵەکان بەوەوە کە تێیاندایە سەرمۆر دەکرێن بە مۆری باوەڕ یا کوفر، لەوەودوا نە باوەڕهێنانی کافر قبوڵەو نە موسوڵمانەکانیش کافر دەبنەوە. ئینجا (شنەبا)کە هەڵدەکات و گیانی هەموو موسوڵمانەکان دەکێشێت و خراپەکاران دەمێننەوە، کە دەکەونە بەر غەزەبی خواو قیامەتیان لێ دێت.. دەستەو دوعاین خوای گەورە ئێمەو موسوڵمانەکانی تر لەسەر دینەکەی ڕاگرێت و نامەی ئەعمالمان بە چاکە قورسترکات و بە لوتفی خۆی بەهەشتمان پێ رەوا

[١] أبو سليمان الخطابي ( العزلة ) (ل ٩٦) چاپی السلفية.

ببینێت و بێ موحاسەبەکردن و سزاو ئازاری پێشوەخت بمانخاتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە نیعمەتی خۆیی پێبەخشیون، وەل پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکاندا، ئای کە هاوڕێیەتی ئەوانە چاکە.. ئەمەش فەزڵ و لوتف و بەزەیی خوا خۆیەتی، هەرکەسێکی پێ شایان بوو بێ بە ڕێنمایی خۆی دەیخاتە ڕیزیانەوە.. خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە.

کەمبوونەوەی زانستی شەرعیی و دەرکەوتنی نەزانیی کە هۆکاری هەموو لاسەنگی و خراپەکارییەکی ترە، لازم و مەلزوومیی یەکن.. کە زانستی شەرعیی بڵاو بێت پابەندی شەرعیی و دینداریی و تەقوا زۆرتر دەبێت. کە زانستیەکە نەما، خراپەکاریی دێتەجێ. خوای گەورە هەموو خراپەیەکی گەڕاندۆتەوە بۆ نەزانین:

. **ئەنجامدانی کردەوەی بەد:** لە نەزانینەوەیە: (إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ) النساء/١٧ واتە: تۆبە بۆ ئەو کەسانەیە کە بە نەزانیین کەوتوونەتە خراپەوە.. هەروەها: (وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُنْ مِنَ الْجَاهِلِينَ) یوسف/٣٣ واتە: ئەگەر مەکرو فێڵی ئەو ژنانەم لێ دوور نەخەیتەوە دەکەومە داویان و دەچمە ڕیزی نەزانانەوە. یان: (قَالَ هَلْ عَلِمْتُمْ مَا فَعَلْتُمْ بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنْتُمْ جَاهِلُونَ) یوسف/٨٩ واتە: مەگەر نازانن ئێوە پێشتر چیتان لە یوسف و براکەی کرد، کە بە نەزانی تێکەوتن.. هەندێك لە زانایانی سەلەف دەفەرموون: هەر کەسێك گوناحێکی کرد، ئەوە نەزانە.

. **دەستدرێژیی و ستەمکاری لە نەزانینەوەیە:** (وَحَمَلَهَا الْإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا) الأحزاب/٧٢ واتە: مرۆڤ کۆڵەکەی هەڵگرت (کۆڵی بانگەوازی خواوویستیی) بەڕاستی ستەمکارو نەزان بوو.

. **نەزانین و گومڕایی:** (وَإِنَّ كَثِيرًا لَيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ) الانعام/١١٩ واتە: زۆر کەس هەر بە هەواو هەوەس خۆیان گومڕا

دەبن، چونكە زانستیان نییە دەكەونە گومڕاییەكەوە. خوای پەروەردگارت زاناترە بە سنوور بەزێن و دەستدرێژكاران.

. **نەزانیین و دووڕوویی**: (وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ)المنافقون/ ٨ واتە: بەڵام دووڕووەكان نازانن.

. **نەزانین و كوفرو لە حەق لادان**: (وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ) التوبة/٦ واتە: ئەگەر یەكێك لە موشریكەكان پەنای بۆ هێنایت داڵدەی بدە، تا فەرمایشتی خوای بەرگوێ كەوێت (ببیستێت) پاشان بە سەلامەتی و ئەمان بیگەڕێنەوە شوێنی خۆی، ئەوێ كە خۆی هەست بە ئەمان دەكات تێیدا، چونكە ئەوان كەسانێكن نازانن.. هەروەها: (قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ) الزمر/٦٤ واتە: بڵێ چما فەرمانی ئەوەم پێدەكەن كە غەیری خوا بپەرستم ئەی نەزانینە. یان: (أَمِ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةًۖ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ هَذَا ذِكْرُ مَنْ مَعِيَ وَذِكْرُ مَنْ قَبْلِي بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُمْ مُعْرِضُونَ) الأنبياء/٢٤ واتە: یان لە جیاتی خوای گەورە خوای تریان داناوە، گوایە خوایانە بۆیە دەیپەرستن! بڵێ دەی ئەگەر ڕاست دەكەن بیسەلمێنن... ئەوە من و ئەوە قورئان، ئەوەش كتێبە ئاسمانییەكانی پێش من، بەڵام زۆرینەیان نازانن حەق چیەو چۆنەو هەر خۆی لێ لادەدەن.

ئەمانە بەڵگەن لەسەر دژواریی و كاریگەریی خراپی نەزانین، لەبەرامبەر پشتگیریی گرنگ و كاریگەریی چاكی زانین، زانستە شەرعیەكان بۆ ناسینی حەق و ڕێزگرتنە لە زانایان و یارمەتیدانیان لە بڵاوكردنەوەی زانستی شەرعیی.. چونكە خراپیی خراپە بە بڵاوكردنەوەی پێچەوانەكەیدا دەردەكەوێت.

لێرەوە باسی بەڵگەی فەرموودە لەسەر گرنگی زانستی شەرعیی و گەورەیی فێرخوازانی تەواو بوو.

## باسی سێیەم

### ڕای سەلەف لەسەر گرنگی زانستی شەرعیی و گەورەیی فێرخوازیی

١- ئەبوعومەری کوڕی عەبدولبەڕ رحمه الله لە سەیدنا على کوڕی ئەبوتالیبەوە خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (العلمَ خيرٌ مِن المالِ، لأنَّ المالَ تَحْرُسُه، والعلمُ يَحرسُكَ، والمالُ تَفنيهِ النَّفَقَةُ، والعلمُ يَزكو على الإنفاقِ، والعلمُ حاكِمٌ والمالُ مَحكومٌ عليهِ، ماتَ خُزَّانُ المالِ وهمْ أحياءٌ، والعلماءُ باقونَ مابقِيَ الدَّهْرُ، أعيانُهم مفقودَةٌ وآثارُهُم في القلوبِ مَوجُودَةٌ) واتە: زانست باشترە لە سامان، چونکە سامان دەبێت ئاگات لێی بێت و پاسەوانی بیت، بەڵام زانست ئاگای لێتەو پاسەوانتە، سامان بە سەرف کردنیی نامێنێت، بەڵام زانست بە لێبەخشینی زیاد دەکات، زانست فەرمانڕواییە، بەڵام سامان حوکمدراوە، گەنجەینەوانانی سامان هەر بە زیندوویی مردوون، زانایان تا دنیا دنیا بێت دەمێنن، بۆ خۆیان وەکو جەستە نەماون، بەڵام شوێنەواریان لە دڵ و دەروونداً بەکاریگەریی هەر ماوەو دەمێنێت).[١]

٢- موعازی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: (زانست فێربن، چونکە وەرگرتنی لەبەر خاتری خودا دەبێتە خواپەرستیی، زۆر زانینی مایەی لە خوا ترسانە، گەڕان لە دووی جیهادە، فێرکردنی نەزان، خێرو خێراتە، لەبەرکردن و باسکردنەوەی زیکری خواو تەزبیحاتە.. بە زانست خوا دەناسرێت و بە زانست بە تاك و پاك دەناسرێت، خوای گەورە بەهۆی زانستەوە

---

[١] جامع بيان العلم ( ٥٧/١) .

گەلانێك وا بەرز دەكاتەوە دەیانكاتە سەركردەو پێشەوای ڕێنمایی، كە ڕای كۆتای خەڵكی بۆچوونی زانایان دەبێت!).[1]

٣- ئەبولئەسوەدی دوئەلی رحمه الله (قوتابی و هۆگری سەیدنا علی خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: (پاشاكان فەرمانڕەوان بەسەر خەڵكییەوە، بەڵام زانایان فەرمانڕەوان بەسەر پاشاكانەوە).[2]

٤- ئەحنەفی كوڕی قەیس رحمه الله دەفەرموێ (زانایان ئاڕاستەوان و پەروەردەكارن، هەر دەسەڵاتێك خۆی بە زانست بەهێز نەكرد، بەرەوە زەلیلی و لاوازیی شۆڕ دەبێتەوە).[3]

٥- ئیبنو عەبدولبەڕ دەفەرموێ: (هەندێك لە زانایان فەرموویانە: ئەوەندە بەسە بۆ پلەو ئاستی باڵاو گرنگیی و گەورەیی زانست كە بە هەركەسێك بڵێن زانایت و شارەزاییت هەیە، دڵخۆش دەبێت، ئەگەرچی لە ئاستیشیدا نەبێت! بە هەر كەسێكیش بڵێن نەزانیت و زانیاریت نییە، دڵگران دەبێت ئەگەر چی نەزانیش بێت).[4]

٦- خەتیبی بەغدادی رحمه الله لە سوفیانی كوڕی عویەینەوە رحمه الله دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (دەزانن نەزانین و زانست وەكو چی وان؟ وەكو دارولكوفرو دارولئیسلامن، ئەگەر موسوڵمانان جیهاد واز لێبهێنن، كافرەكان دێنە سەریان و ئیسلامەكەیان لێدەستێنن، ئەگەر خەڵكیش زانست وەل (ترك) بكەن هەموو بە نەزانیی دەمێننەوە.. باڵاترین پلە لای خوای گەورە بۆ

---

[1] مجموع الفتاوى (٩٣/١٠). نوسەری بەڕێز نوسیوێتی: (وروى ابن عبدالبر هذا الأثر عن معاذ مرفوعا بأطول من هذا، ولكن إسناده ضعيف).

[2] جامع بيان العلم (٦٠/١).

[3] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە.

[4] هەمان سەرچاوە (ل٥٩)

ئەو کەسانە دانراوە کە وان لە نێوان خوای گەورەو عەبدەکاندا: پێغەمبەران و زانایان).[1]

٧- هەر ئەو لە ئیمامی ئەبوحەنیفەوە رحمە اللّٰہ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (ئەگەر شەرعناسان و زانایان لە ڕیزی ئەولیایانی خوا هەژمار نەکرێن، ئەوە خوای گەورە یەك وەلیی نییە).[2]

٨- لە ئیمامی شافعییەوە رحمە اللّٰہ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (زانایان و شەرعناسان ئەولییای خوای گەورەن).[3]

٩- هیلالی کوڕی خەببابیش دەیفەرموو: (بە سەعیدی کوڕی جوبەیرم ووت: ئەریٚ ئەبوعەبدوڵلا نیشانەی بە خەسارەت چوونی خەڵکی چییە؟ فەرمووی: نەمانی زاناکانیانە، کە ئەوان نەمان ئەمانیش دەفەوتێن).[4]

١٠- ئیمامی جەعفەری صادق رحمە اللّٰہ دەفەرموێت: (ئیبلیس بە مردنی کەس خۆشحاڵ نابێت بەقەد ئەوەندەی کە بە مردنی زانایەك خۆشحاڵ دەبێت).[5]

١١- ئیمامی شافیعی دەفەرمویٚ: (وەرگرتنی زانستی شەرعیی باشترە لە نوێژی سوونەت) هەروەها دەفەرمویٚ: هەرکەسێك ژیانی دنیای دەویٚ، با زانستی شەرعیی وەرگرێت، هەرکەسێکیش رۆژی دوایی دەویٚ، با زانستی شەرعیی وەرگرێت) هەروەها دەیفەرموو: (کەس بە هیچ شتێك لە خوای گەورە نزیك

---

[1] الفقه والمتفقه (١\٣٥).

[2] هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

[3] هەمان سەرچاوە (٣٥/١. ٣٦).

[4] هەمان سەرچاوە (٣٧/١).

[5] جامع بيان العلم (٦٠/١)

نابێتەوە جگە لە فەرزەکان وەك وەرگرتنی زانستی شەرعیی) واتە: دوای فەرزەکان باشترین هۆکار بۆ لە خوا نزیکبوونەوە وەرگرتنی زانستی شەرعییە.[١]

١٢- ئیمامی غەززالی رحمه الله دەفەرموێ: (بە دەگمەن هەیە قبوڵ بکات پێی بڵێن لە ڕیزی نەزاناندایت، بەتایبەتی لە زانینی شەرعدا، بۆیە دەبینیت ئەو کەسەی تەبیعەتی تووڕەیە، چەند تووڕە دەبێت کە پێی دەڵێن: هەڵەتکردووەو نەتزانیووە! جا دەشیبینیت - دوای روون بوونەوەی حەقەکەو زانینی- چۆن بەرگریی لە نەزانییەکەی خۆی دەکات و خەمی ئەوەی لێ دەنیشێت کە ئەگەر حەق دەرکەوێت، ئەم فەزح دەبێت! چونکە دەزانرێت کە راستەو نەزانە! سروشتی خەڵکی وایە کە سوورن لەسەر داپۆشینی عەورەتیان، بەڵام سوورترن لەسەر داپۆشینی نەزانین و کەشف نەبوونیان، چونکە نەزانین ناشیرینی دەروون و رەش داگەڕانی روخسارە! نەزان لەسەر نەزانینەکەی لۆمەی لێ دەکرێت. دەرکەوتنی نوقسانی عەورەت دەرکەوتنی حەقیقەتی جەستەیە، بەڵام کەشف بوونی نەزانین دەرکەوتنی وێنەی دەروون و شەرمەزاریی و بچووك بوونەوەی کەسەکەیە، کە جێی سەرزەنشتکردنە، نەفسیش لە جەستە بەرزو باڵاو بەنرخترە، بۆیە عەیب و عاری دەروونیی ناشرینترە وەك لە عەیب و عاری جەستەیی. کەم و کورتیی جەستە سروشتی خەلقبوونێتی و لە دەست خۆیدا نەبووە، بەڵام کەم و کورتیی نەزانینی خەتای خۆیەتی، چونکە دەیتوانی نەزان نەبێت، دەیتوانی هەوڵی فێربوون بدات، بەڵام کەمتەرخەم و ئیهمال بووە، بۆیە ژان و خەمی کەشفبوونی نەزانیی کەسێك زیاتر ئازاری دەدات، وەك دەرکەوتنی نووقسانی لەشی. هەر وەکو کە شادمان و سەربەرزە کە زانا دەردەکەوێت و ئاستی باڵای زانینەکەی دەزانرێت).[٢]

---

[١] ئیمامی نەوەوی رحمه الله (المجموع (١٢/١) دا هێناوێتییەوە.

[٢] إحياء علوم الدين (٣٥٧\٢) .

ئەمە کۆتا بڕگەی باسی راوبۆچوونی سەلەفە، کە ئێمە دەربارەی گەورەیی و گرنگیی زانست و بەڕێزیی خوێندکارانی هێناومانەتەوە..

## باسی چوارەم

### کێ شایانی پلەی ڕێزی زانایانە و چەند؟

لە باسەکانی ڕابردوودا باسمان لە گرنگی زانست و ڕێزو گەورەیی زانایان و فێرخوازانی زانستی شەرعیی کرد، باسمان لە زۆریی پاداشت و پلەی دنیاو قیامەتی ئەهلی عیلم کرد. بەڵام بێگومان زانستەوانانی شەرع هەموو وەك یەك نین، وەك لە دونیادا ئاست و پلەی ناوی زانایان و گشتی خەڵکی لە یەکتر جودایە، لە قیامەتیشدا پلەو ئاستیان جودان، لە دونیادا بەهۆی بڕی زانین و ڕادەی پێوە پابەند بوون و کەم و زۆریی گەیاندنەوەو بەرهەمی زانست لێك جودان و هەر یەکەیان لە پلەیەکدایە، حەتمەن لە دوارۆژیشدا مەنزیلەی هەر یەکەیان لەگەڵ لە خۆی زاناترو پابەندترو زۆرنووسدا جیاوازن.. خوای گەورە دەفەرموێت:

- (أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ) الرعد/ ١٩ واتە: جا ئەو کەسەی دەزانێت و قەناعەتی وایە کە ئەمەی بۆ جەنابت هاتۆتە خوارەوە - کە بێگومان لەلایەن خوای گەورەوە نێردراوە - ئەمە وەکو ئەو کەسە وایە کە کوێرەو خۆی لە ئاستی حەقدا نابینا کردووە؟! ئەوانەی خاوەن هزرو ژیرین و پەی بەمە دەبەن و هۆشی دەخەنە سەر.

- (أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَ قَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ) الزمر/٩ واتە: بڵێ ئایا ئەو کەسانەی دەزانن و ئەو کەسانەی نازانن وەك یەکن، ئەو کەسانە پەی بەم جیاوازییە دەبەن کە خاوەن هزرو درکن و ژیریيان دەخەنەکار.

- لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئاستی جیاوازی وەرگرانی زانستی شەرعیی و ڕادەی پێوە پابەندبوون بە گەیاندنەوەی

زانستەکەیان لە دونیادا جودایەو لە ڕۆژی دوایشدا پاداشتیان بە پێی ئەم کەم و زۆریانە دەدرێتەوە. بۆیە لەوێش پلەیان جودایە.. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێ: (مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْمِ كَمَثَلِ الْغَيْثِ الْكَثِيرِ أَصَابَ أَرْضًا، فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ، قَبِلَتِ الْمَاءَ، فَأَنْبَتَتِ الْكَلأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ، أَمْسَكَتِ الْمَاءَ، فَنَفَعَ اللَّهُ بِهَا النَّاسَ، فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا، وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لاَ تُمْسِكُ مَاءً وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللَّهِ، وَنَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ) [١] واتە: نموونەی من و ئەو ڕێنمایی و زانستییەی خوای گەورە بە مندا ناردوویەتی وەکو بارانێکە کە بە لێزمە ببارێت، باریوەتە سەر ناوچەیەکی بە پیت، کە ئاوەکەی لە خۆ گرتووەو گژو گیایەکی زۆری پێ بەرهەم هێناوە، ناوچەیەکی تریش بەردەڵانی زیخ و چەوە کە ئاوەکەی لە خۆ گرتووە (هیچی پێ نەڕواندووە) بەڵام بووە بە ئەستێلێك و خەڵکی ئاوی لێ دەخۆنەوەو مەڕو ماڵاتیانی لێ ئاو دەدەن و ئاودێریی چاندن (کشتوکاڵ)ەکەشیانی پێ دەکەن، ناوچەیەکی تریش زەوییەکەی فشەڵ بووە، نە ئاوەکەی لە خۆگرتووە (بۆ سوودی خەڵك و گیانلەبەر و ڕووەك) نە بە پیتیش بووە، تا گژوگیایەکی پێ بڕوێنێت ئەو کەسەش کە لە دینەکەی خوا تێگەشتووەو ئەوەی وەرگرتووە کە خوای گەورە منی پێ کردۆتە پێغەمبەری خۆی، فێر بووەو فێریشی کردووە (ئەمە وەکو خاکە بە پیتەکەیە. هەروەها وەکو ئەو کەسەشە کە سەربەرزییەکی بەم

---

[١] بوخاری (ژ٧٩) لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە خوا لێی ڕای بێت.

(وەحییە) بۆ خۆی مسۆگەر نەکردووە و ئەو هیدایەتە خواییەی وەرنەگرتووە کە بە مندا نێردراوە، چونکە گوێی نەداوە بە زانستە شەرعییەکە.

ئیبنوحەجەر رحمه الله لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (قورتوبی فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نموونەی خۆی و ئەو وەحییەی کە بۆی هاتووە بە بارانێکی گشتگیر چواندووە، کە لە زەمانێکدا باریووە کە خەڵکەکە موحتاجی بوون.

حاڵی ئەو خەڵکەش کە پێغەمبەری خوایان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ هات ئاوا بوو، جا چۆن باران خاکی مردوو زیندوو دەکاتەوە، زانستی شەرعیش دڵی مردوو زیندوو دەکاتەوە، پاشان گوێگر و وەرگرەکانی بەو جۆرە خاکانە چواندووە کە بارانەکەیان بەسەردا باریووە. جا چۆن خاکی واهەیە بە پیتەو ئاو لەخۆ دەگرێت و دەیکاتە مایەی سوودی زیندەوەران، خەڵکانێکیش هەن بەم زانستە شەرعییە دەبنە زانای کردەوەیی فێرکار (العالِم العامِل المُعَلِّم ) هەروەها خەڵکانێکیش هەیە کە زانستیەکە لە خۆ دەگرن و بۆ خۆیان سوودمەند دەبێت، فەرزەکان دەکەن و سوونەت وازلێدەهێنن، بەڵام زانستەکە دەگەیەننەوە بە خەڵکی تر، ئەمانە وەکو زەوییە بەردینەکەن، کە ئاوەکەی ڕاگرت و کردییەوە بە ئەستێڵێك (حەوز) بۆ غەیری خۆی، ئەم پۆلەی دووەم لەو فەرموودەیەدا ئاماژەیان پێکراوە کە دەفەرموێ: (نَضَّرَ اللَّهُ امْرَءًا سَمِعَ مَقَالَتِي فَوَعَاهَا فَأَدَّاهَا كَمَا سَمِعَهَا)[1] واتە: خوا ڕووی ئەو کەسە گەشترکات کە قسەکەمی گوێ لێ دەبێت و وەکو کە بیستوویەتی نەقڵی دەکاتەوە.. ئینجا پۆلە خەڵکێکی ترهەن کە نە زانستە شەرعییەکە وەردەگرن و نەکاریشی پێوەدەکەن و نەدەشی گەیەنن بە خەڵکی.. ئەوە وەکو زەوییە

[1] ترمذي (٢٦٥٧)، ابن ماجة (٢٢٨)، أحمد (٤١٤٦).

فشەڵەکە بوو، کە ئاو ناگرێتە خۆی و بۆگەنیشی دەکات تا زیندەوەران سوودی لێ نەکەن!!

نموونەکە دوو پۆلی یەکەمی مەدحکردووە چونکە هەردوو لایان هۆکاری سوود گەیاندنەوەن بە خەڵکی، بەڵام پۆلی سێیەم زەمکراون، چونکە کەس سوود لە بوونیان ناکات والله أعلم، پاشان بۆم دەرکەوت (ئیبنوحەجەر دەفەرموێ) کە پۆلی دووەم هاتوونەتە دینەکەوە بەڵام زانستە شەرعییەکەیان نەبیستووە (نایزانن)، یان زانیویانە بەڵام کاریان پێ نەکردووە و خەڵکی تریان فێرنەکردووە بۆیە فەرمووی: (مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا) مەبەست لەوەیە کە گوێی نەداوەتێ و سوودی لێوەرنەگرتووە، یان سوودی نەگەیاندۆتەوە پێی، ئەمما پۆلی دوایین پێم وایە ئەوانەن کە هەر داخڵی دینەکە نەبوون. پێیان گەیشتووە بەڵام باوەڕیان پێنەهێناوەو بە کافر ماونەتەوە، ئەمە زەویە فشەڵە خراپەکەیە چونکە دەفەرموێ: (وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ).

الطيبی دەفەرموێ: (دوو پۆل لە خەڵکەکە ماونەتەوە، یەکەمیان: ئەو کەسەیە کە سوودی بۆخۆی لە زانستە شەرعییەکە وەرگرتووە، بەڵام خەڵکی تری فێر نەکردۆتەوە، دووەمیان خۆی سوودی لێنەکردووە، بەڵام گەیاندویەتی بە خەڵکی، دیارە دووەمیان هەر لە ناو پۆلی یەکەمیاندایە، چونکە سوودەکە بۆ هەردوو لا هەر بووە، با جیاوازیش بوون، زەوییەکان وان.. دووەمینەکەیان ئەگەر فەرزەکانی کردبێت و سووننەتی نەکردبێت لە پۆلە مەدحکراوەکەی دووەمدایە، بەڵام ئەگەر فەرزەکانی بە جێنەهێنابێت

ئەوە فاسقەو جائیز نییە زانستی لێوەر بگیرێت، ڕەنگە بچێتەوە خانەی (مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا) والله أعلم.[1]

خەتیبی بەغدادیی رحمە اللە هەر لە ڕاڤەی ئەو فەرموودەداو لەو ڕوانگەوە دەفەرموێ: (پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەم فەرموودەدا ئاست و پلەی شەرعناسان و خۆ بەشەرعزانانی دیاریکردووە، بۆ ئەوەی کەسیانی لێ دەربکات، زەوییە بە پیتەکە نموونەی شەرعناسی سەر ڕاست و ووردەکارە، ڕاست لە دینەکە گەیشتووە و پێوەی پابەندە و لە ڕاجوێیدا دەگەڕێتەوە سەر قورئان و سووننەت، زەوییە بەردەڵانییەکە کە ئاوەکەی لە خۆ گرتووەو خەڵکی لێی دەخۆنەوە، نموونەی ئەو کەسانەیە کە ئەوەی بیستوویانە لەبەریان کردووەو بەس، باشیان وەرگرتووە، پاراستوویانە، وەك خۆی گەیاندویانەتەوە بێ کەم و زیاد، لەوانەیە ئەوەندە توانای لێوەرگرتن و پەی پێبردنی نەبووبێت، بتوانێت ئەحکامەکانی لێ هەڵهێنجێنێت، بەڵام خوای گەورە کردوویەتی بە هۆکاری پاراستن و گەیاندنەوەی زانستەکە بە خەڵکی تر، کە لەوانەیە تییایاندا بێت لەو زیرەکتر بێت و پەی بە ئەحکامەکانی ببەن. هەر وەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (رُبَّ مُبَلِّغٍ أوعَى مِن سامِعٍ وَرُبَّ حامِلِ فِقْهٍ ليسَ بِفَقِيهٍ) واتە: دەشێت ئەوەی پێی دەگەیەنرێت شیاوترو زرنگتر بێت بۆی وەك لەوەی بیستوویەتی، دەشێت کابرا زانستەکەی لابێت بەڵام پەی بە چۆنێتی وەرگرتنی ئەحکام نابات لێی.

ئەو کەسەی کە نە ئەوەی پاراستووە کە بیستویەتی و نە ووردەکاریش بووە لە گەیاندنەوەیدا، ئەوە وەکو زەوییە بەپیتەکە نییە، وەکو زەوییە بەردەڵانیەکەش

---

[1] . فتح الباري (١\١٧٧) .

نییە، بەڵکو مەحرومە، وەکو زەوییە فشەڵەکەیە کە نە ئاوەکەی بۆ خۆی و زیندەوەران گرتە خۆ تا سوودی هەبێت، نە ئەستێڵکێکیشی پێ دروستکرد، نە گیایەکی پێ ڕواند.. خوای گەورە دەفەرموێت: (هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ) الزمر/٩ واتە: ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن و ئەو کەسانەی کە نازانن وەکو یەکن؟ یان: (أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى) الرعد/١٩ واتە: چما ئەو کەسەی کە دەزانێت ئەمە وەحییەو حەقەو لە خوای پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە وەکو ئەو کەسەیە کە کوێرە؟! خوای گەورە ئەو کەسەی چوواندووە بە سەگ کە گوێ بە هیدایەت و زانستی خوای گەورە نادات، کە بەوەحی بۆ پێغەمبەرانی خۆیی سڵاوی خوایان لێبێت ناردووە! وەکو دەفەرموێ: (وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ * وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ ۚ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ ۚ ذَلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۚ فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ) الأعراف/١٧٤ واتە: نموونەی ئەو کەسەیان بۆ بهێنەرەوە کە ئایەتەکانی خۆمانمان پێدابوو، کەچی لەبەر خۆیی داماڵی؟ ئیتر شەیتان کەوتە دوایی و چووە ڕیزی زەرەرمەندانەوە، ئەگەر بمانوویستایە هەر بەو ئایەتانەی خۆمان پایەدارمان دەکرد، بەڵام ئەو خۆی وایزانی لە ژیاندا نەمرانە دەمێنێتەوە! بۆیە باوەشی بە زەویدا کرد، شوێن هەواوهەوەسی خۆی کەوت، نموونەی ئەوە وەکو سەگە کە ڕاوی بنێیت هەر دەمەلاسکەو هانکە هانکێتی و (ماندووە) و زمانی لە تاواندا دەرکێشاوە! لێشی بگەڕێت هەر وایە! ئا ئەوەیە نموونەی ئەو کەسانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆخستۆتەوە؟ ئەو

بەسەرهاتەیان بۆ بگێڕەرەوە؟ تا عەقڵیان پێ بشکێت و هۆشیان بێتەوە بەرو بیرکردنەوە..[1]

ئینجا برا شیرینەکەم سەیری خۆتکەو بزانە پلەو ئاستت لە کوێدایە، ئەوە پلەو ئاستی خەڵکییە لە وەرگرتنی زانستی شەرعیی و پێوەپابەند بوون و گەیاندنەوەی، کە بە پێی بیرو ڕادەو چۆنێتی و زۆر و کەمییان پاداشتی قیامەتیشیان بۆ دیاری دەکرێت.. بزانە تۆش پاداشتت چەندەو لە کوێدایت؟ هەر چییەك بێت و لە هەر کام پلەو ئاستێکدا بیت بە کەمی بزانەو هەوڵی وەرگرتن و فێربوون و پابەندبوون و گەیاندنەوەی زیاتر بدە، پێش ئەوەی لە دنیادا دەست و بێتوانا بیت، پێش ئەوەی مەرگت بگاتێ و لە قیامەتا خۆت بینیتەوە. کە لەوێ هیچ بوارێکی چاکەو خێر پەیداکردن نامێنێت، نە بە وەرگرتنی زانست و گەیاندنەوەی و نە بە سامان و بەخشین.

ئەمە کۆتایی ئەم بابەتە بوو (گرنگی زانستی شەرعیی و گەورەیی فێرخوازانی). إن شاء الله بابەتی دوای ئەم (حوکمی وەرگرتنی زانستی شەرعیی)ە، زەروور بوو بزانین زانستە شەرعییەکە چەند گرنگەو کاریگەرە، پێش ئەوەی حوکمی وەرگرتنی لە ڕووی شەرعییەوە بزانیین.

خوای گەورەش یارمەتیدەرمان بێت.. اللهم أمين.

---

[1] **الخطیب البغدادي: الفقه المتفقه ( ١\٤٩).**

# ناوەڕۆك

